# لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّه و مەرجەكانی

كتێبی: لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰه و مەرجەكانی

ئامادەكردنی: زانـا الـكـردي



# پێڕست

# پێشەکی

بِسْمِ االلهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

الحمدلله وحده ، والصلاة و السلام على من نبي بعده ، و على آله وصحبه و بعد :
بزانە ڕەحمەتی الله تعالى ــت لێ بێت پێویستە و واجبە لەسەرت کە واتای ( لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ الله ) بە تەواوی بزانی وەک ئەوەی پێغەمبەر { ﷺ } و هاوەڵاکانی رَضِيَ اللهُ عَنْهُم و دوای ئەوانیش لە سەلەفی ساڵح زانیویانە و لێی تێگەیشتوون و جێبەجێیان کردووە ، وە ئەمە ئەو کەلیمەیە کە یەکەم جار لە ڕێگەیەوە داخڵی ناو دینی ئیسلام دەبیت بە بێ ووتنی ئەمە داخڵی دینی ئیسلام نابیت و بە موسڵمان حسێب ناکرێیت ، وە ئەمە ئەسڵی دینەکەتە و نابێت جاهیل بیت پێی جاهیل بوون بەمە نابێتە عوزر بۆت تا لە قیامەت ڕزگارت بێت لە ئاگر و بچیتە بەهەشت ، جا بزانە ڕەحمەتی الله ــت لێ بێت ئەمە ئەو کەلیمەیە کە هەموو پێغەمبەران علیهم سلام لە پێناویدا نێردراون تا گەلەکەیان تێ بگەیەنن کە تەنها الله شایەنی پەرستنە و پشت بکەنە هەموو پەرستراوێکی تر لە غەیری الله  جا تێگەیشتن و جێبەجێکردنی ئەم کەلیمەیە کە ( لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ الله )ــیە دەبێتە هۆی ئەوەی کە بچیتە بەهەشت و لە ئاگری دۆزەخ ڕزگارت بێت جا بە بێ ئەمە ڕزگار بوونت ئەستەمە بۆیە ئەی ئەو کەسەی خۆت بە موسڵمان دەزانیت واجبە لەسەرت لەم کەلیمەی ( لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ الله )ــیە تێبگەیت و مافەکانی بدەیت تا ببیتە یەکێک لە ئەهلەکەی و لە قیامەت بتباتە بەهەشتەوە و دوورت بخاتەوە لە ئاگر .

✐زانا الكردي.

# واتای لا إله إلا الله

- ئایا دەزانی واتای ( لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ الله ) چییە ؟

ئەو کەلیمەیەی هەموو پێغەمبەران علیهم و السلام لە پێناویدا ڕەوانەکران.
ئەو کەلیمەیەی بە سەدان و هەزاران پێغەمبەر و موسڵمان خوێنیان لە پێناویدا ڕژا.
ئەو کەلیمەی کە هەموو مەخلوقات لە پێناویدا دروست بووە .
ئەو کەلیمەیەی مانای توحیدی تێدایە و دەتباتە بەهەشت و لە دۆزەخ ڕزگارت دەکات .

ووشەی ( لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ الله ) :
واتە : لا معبود بحق إلا الله ، هیچ پەرستراوێک نییە شایەنی پەرستن بێت بە حەق تەنها الله تعالی نەبێت .
هەر وەکو الله تعالی دەفەرموێت : [ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلعَلِيُّ ٱلكَبِيرُ ] { الحج ٦٢ } .
واتە : ئەو بیستن و بینینەش بەهۆی ئەوەیە چونکە بە ڕاستی الله خۆی حەق و ڕاستە ، ئەوانەش کە ئەوان هانا و هاواری بۆ دەبەن لە جیاتی ئەو هەر ئەوە خۆی بەتاڵ و ناحەقیە ، بێگومان ئەو الله ــیە بڵند و بەرز و مەزن و گەورەیە .
ئەم بەشەی ئایەتەکە [ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلحَقُّ ] واتە بێگومان تەنها الله حەق و شیاوی پەرستنە ، وە هیچ شەریک و هاوبەشێکی نییە .
وە ئەم بەشەی تری [ وَأَنَّ مَا يَدعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلبَٰطِلُ ] واتە ئەوەی کە خەڵکی تر یان ئەو موشریکانە هاواری بۆ دەبەن جگە لە الله بێگومان ئەوە بەتاڵە و حەق نییە وە شایەنی پەرستن نییە چونکە دەسەڵاتێکی نییە ئەویش وەک خۆیان دروستکراوە چۆن دەبێت هانا و هاوار بۆ دروستکراوەکان ببردرێت ! کە خۆیان دروستکراون و توانایان نییە خۆیان ڕزگار بکەن لە سزا ئەی چۆن دەتوانن ئێوە ڕزگار بکەن !.

ابن جُرَيج(١٥٠هـ) له تەفسیری ئەم ئایەتە [ وَأَنَّ مَا يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلۡبَٰطِلُ ] دەفەرموێت : واتا شەیتان .
( واتە ئەوەی دەیپەرستن لە غەیری الله شەیتانە یان شەیتان ئەو کارەیان پێدەکات ، والله أعلم ) { تفسير الطبري }

وە الله تعالی لەسەر زمانی پیغەمبەران (عليهم السلام) پێمان ڕادەگەیەنێت کە تەنها و تەنها الله خۆی حەقە و شایەنی پەرستنە و وە کەسی تر شایەنی پەرستن نییە ، هەر لە پێغەمبەر نوح ـەوە (عليه السلام) هەتا کۆتایی پێغەمبەر { ﷺ } هەموویان فەرموویانە الله بە تاک و تەنها بپەرستن و وە شەریکی بۆ بڕیار مەدەن چونکە هیچ خوایەکی تر نییە شایەنی پەرستن بێت جگە لە ئەو ، هەر وەک الله تعالی دەفەرموێت : [ لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ] { الاعراف ٥٩ }.
واتە : سوێند بە الله بە پێغەمبەرێتی نوح ـمان ناردە لای هۆز و نەتەوەکەی خۆی جا ووتی : ئەی هۆزی من ! هەر الله بپەرستن کە بێ لەو هیچ خوایەکی تر نییە شیاوی پەرستن بێت ، واتە : نابێت لە بەرنامەی هیچ کەسێکی تر پەیڕەوی بکەن چونکە ئەگەر ئێوە بڕوا نەهێنن ، بە ڕاستی من لە سزای ئەو ڕۆژە گەورەیە لێتان دەترسم کە پێش دێت .
ئەم بەشەی [ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ ] واتە الله بە تەنها بپەرستن وە هەر ئەو شایەنی پەرستنە جگە لەو کەسی تر شایەنی پەرستن نییە .
وە ئەم بەشەی تر [ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ ] واتە لە غەیری الله هیچ خوایەکی تر نییە و هەموو ئەوانەی تر کە بانگەوازی خوایەتی دەکەن یان کراون بە خوا ئەوە پووچ و بەتاڵە ، وە ئەمە نەفی هەموو پەرستراوێکی کرد کە لە غەیری الله دەپەرسترێن .
وە ئەوەش بزانە کە هەموو بەرنامە و ڕێبازێک جگە لە بەرنامە و ڕێبازی ئیسلام پووچ و بەتاڵە و بەرنامە و حوکمی جاهیلیەتە ، وە هیچ بەرنامەو ڕێبازێک شایەنی ئەوە نییە ببێ بە حاکم لە کەلامەکەی الله تعالی نەبێت کە قورئانە و بۆ مرۆڤایەتی ڕەوانەی کردووە تا ببێت بە حاکم لە نێوانیاندا و بۆ هەر کێشە و گیر و گرفتێک بگەڕێنەوە بۆ کەلامەکەی الله تعالی .

# لا إله إلا الله

## دوو ڕووکنی هەیە

**یەکەم (نەفی) {لَاْ إِلٰهَ} : لەم بەشەدا نەفی هەموو پەرستراوێکی تر دەکەیت کە جگە لە الله بپەرسترێت و گوڕایەڵی بکرێت و شوێن کەوتەی هەبێت وە بە پووچ و بەتاڵی دەزانی و بێباوەڕ دەبیت پێی ، بە شێوازێکی تر واتە : نا بۆ طاغوتەکان نا بۆ ئەربابەکان نا بۆ پەرستراوە بەتاڵەکان نا بۆ یاسای دەسکرد و دەستورە کوفرینەکان کە وڵاتە بە ناو ئیسلامیەکان و غەرییبەکان حوکمی پێ دەکەن ، ئەمە پێکهات لە {نەفی} .**

**دووەم (إثبات) {إِلَّاْ الله} : لەم بەشەسدا پەرستراوێتی بۆ الله جێگیر دەکەیت کە هەر بە تەنها الله مافی پەرستنی هەیە و هەر الله حەقە کە پەیڕەوی لێ بکرێ و گوێڕایەڵی بکرێ و شوێن ڕێگە و ڕێبازەکەی بکەویت ، بە شێوازێکی تر واتە : بەڵێ بۆ الله کە بە تاک و تەنها بیپەرستم و بۆ شەریعەتە پاک و بێ گەردەکەی بە ببێ بە حاکم و حوکمی جیهانیان بکات ئەمەش پێکهات لە (إثبات) .**

**هەردوکیان لە خۆت بێنەجێ ئەگینا ڕەنجەڕۆ و خەسارەتمەندی .**

# فەزڵ و گەورەیی لا إله إلا الله

دەربارەی فەزڵ و گەورەیی ( لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ الله ) :
ئیمامی ابن رجب الحنبلي (٧٩٥هـ) دەفەرموێت : وشەی تەوحید کۆمەڵێک فەزڵی گەورەی هەیە ناگونجێت لێرە بە درێژی و بە تەفاصیل باسی بکەین ، بۆت باس دەکەم کەمێک کە لە بارەیەوە هاتووە ، ( لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ الله ) وشەی تەقوایە هەر وەک کە ئیمامی عمر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) و هاوەڵان بە کەلیمەی تەقوا تەفسیری وشەی ( لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ الله ) ـیان کردووە ، وە وشەی پاڵفتەی نیەتە بۆ الله ، وە شایەتی دانێکی ڕاست و دروستە ، وە بانگەوازێکی دروستە ، وە خۆ بەری کردنە لە شیرک وە ڕزگار بوونە لەم ئەمرە (واتە لە شیرک ڕزگارت دەکات لە قیامەت) وە لە پێناویدا دروستکراوەکان دروستکراون .

وەک الله تعالى دەفەرموێت: [ وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ] { الذاريات ٥٦ } ، وە لە پێناویدا پێغەمبەران علیهم السلام ڕەوانە کراون وە کتێبەکان دابەزێنراون (کتێبە ئاسمانییەکان) ، وەک الله تعالى دەفەرموێت : [ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ] { الأنبياء ٢٥ }

وە الله تعالى دەفەرموێت : [ يُنَزِّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنۡ أَمۡرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦٓ أَنۡ أَنذِرُوٓاْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱتَّقُونِ ] { النحل ٢ } ، نمونەی ئەم ئایەتانەش زۆرن دەربارەی فەزڵی ( لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ الله ).

ناتوانرێت بژمێردرێت لەسەر بەندەکانی لەو بەخشیشانەی پەروەردگار لە سورەتی ئایەتی النعم (واتە ئایەتی بەخشیش) هاتووە کە ئەم سورەتەش ناوی لێ نراوە (النحل) وە لەبەر ئەوەیە

ئیمامی سفیان بن عیینة (١٩٨هـ) رحمه الله دەفەرمویٚت : هیچ بەخشیشێکی الله تعالی لەسەر بەندەکانی نەبووە لە بەخشیشێک گەورەتر بێت لەوەی کە وشەی توحید کە ( لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ الله )ـیە بناسیٚت ، وە وشەی توحیدی ( لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ الله ) بۆ ئەهلی بەهەشت وەکو ئاوێکی سارد و سازگار وایە لەوەی کە ئەهلی دونیا پێویستی پێی دەبێت ، وە لە پێناوی وشەی ( لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ الله ) ماڵی پاداشت ، وە ماڵی سزا ئامادە کراوە ، وە لە پێناوی وشەی ( لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ الله ) فەرمان کراوە کە پێغەمبەران علیهم السلام کە جیهاد بکەن ، هەر کەسێ بڵێ ( لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ الله ) ماڵ و خوێنی پارێزراو دەبێت ، وە هەر کەسێک ڕەتی کاتەوە و نەیەوێت ئەوە ماڵ و خوێنی بەزایە چووە ، وە ( لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ الله ) کلیلی بەهەشتە ، وە کلیلی بانگەوازی پێغەمبەرانە علیهم السلام ، وە بەو وشەیەش الله تعالی قسەی پێ لەگەڵ موسىٰ علیه السلام کردوو کردی بە پارێز بەندیەک بۆی تا لە شەڕ و خراپە بیپارێزێت.

{ كلمة الإخلاص لإبن رجب الحنبلي ص-٥٢-٥٣ }

فەزڵی ( لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ الله ) لە فەرموودەکانی پێغەمبەر { ﷺ } :

تەوحید لە پێش هەموو شتێکەوەیە !!
سەرەتای بانگەوازی بۆ ( لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ الله )ــیە .....

ابن عباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) دەفەرمویٚت : کاتێ پێغەمبەر { ﷺ } معاذ بن جبل ـی (١٨هـ) (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) نارد بۆ یەمەن ، پێی فەرموو : داوایان لێ بکە شایەتی بدەن کە هیچ خوایەک نییە شایەنی پەرستن بێت بە حەق جگە لە الله وە محمد ـیش { ﷺ } نێردراوی الله ـیە ، ئەوجا ئەگەر بۆ ئەمە بە گوێیان کردی ئەوا پێشیان بڵێ : کە الله لە هەموو شەو و ڕۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەریان فەرز کردووە جا ئەگەر بۆ ئەمەش بە گوێیان کردی ، ئەوا پێیان بڵێ : لە الله زەکاتی لەسەریان فەرز کردووە ، کە لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێ و دەدرێتەوە بە هەژارەکانیان .

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ النَّبِيَّ { ﷺ } بَعَثَ مُعَاذًا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ إِلَى الْيَمَنِ، فَقَالَ : ادْعُهُمْ إِلَى شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ قَدِ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً فِي أَمْوَالِهِمْ تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ وَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ .

{ صحيح البخاري ١٣٩٥ }.

له عوبادەی کوڕی صامیت (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) له پێغەمبەرەوە { ﷺ } دەفەرموێت : هەر کەسێک شایەتی بدات کە بێجگە لە الله خودای تر نییە و هەر خۆی خودای بەهەق و تاک و تەنیایە و هاوبەشی نییە وە شایەتی بدات کە محمد بەندە و پێغەمبەری الله ـیە وە عیساش بەندە و پێغەمبەری الله ـیە و بە فەرموودەی الله لە مریم بووە و ڕەحمەتێکە و الله ناردویەتی وە شایەتی بدات کە بەهەشت ڕاستە و دۆزەخ ڕاستە ، هەرکەسێ ئەم شایەتیە بدات لەسەر ئەم شێوەیە الله دەیخاتە بەهەشتەوە ئیتر کردەوەی هەرچی بێت .

عَنْ عُبَادَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ { ﷺ } قَالَ : مَنْ شَهِدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَأَنَّ عِيسَى عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ - أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ عَلَى مَا كَانَ مِنَ الْعَمَلِ

{ صحيح البخاري ٣٤٣٥ }

وشەی تەوحید ( لَآ إِلٰهَ إِلَّآ الله ) هۆکارە بۆ چوونە بەهەشت ئەگەر هێندەی هەموو دونیا تاوانیشت هەبێت :

له عەمری کوڕی عاصەوە( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەگێڕنەوە ، کە پێغەمبەری اللّٰه { ﷺ } فەرموویەتی: اللّٰه تعالی لە ڕۆژی قیامەتدا پیاوێک لە ئومەتم هەڵدەبژێرێ بە بەرچاوی بەدیهێنراوانەوە کردەوەکانی دەخەنە ڕوو لە چەند تۆمارێکدا کە ژمارەیان دەگاتە نەوەد و نۆ تۆمار ، هەر تۆمارێک ئەوەندەی چاو کار بکات و ببینێ دەبێت ، پێی دەوترێت : ئینکاری هیچ شتێ لەمانە دەکەیت ؟ مەلائیکەکانم ئەوانەی کە

کردەوەکانی تۆیان تۆمار کردووە هیچ ستەمێکیان لێ کردوویت ؟ هیچ بەهانەیەکت هەیە ؟ دەڵێ : نەخێر ئەی پەروەردگارم ، اللّٰه تعالی دەفەرموێت : تۆ کردەوەیەکی چاکەت لای ئێمەیە ، ئیمرۆ هیچ ستەمێکت لێ ناکرێت ، پسووڵەیەکی بچوکی دەدەنێ: ( أَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰه و أَشْهَدُ أَنَّ محمد عَبْدُهُ و رَسُولُه )ـی تێدایە ، دەڵێ : ئەی پەروەردگار ئەم پسووڵە بچوکە لەگەڵ ئەو تۆمارە گەورانەدا چییە ؟ دەفەرموێت : بێگومان تۆ زوڵم و ستەمت لێ ناکرێ ، تۆمارە گەورەکان دەخەنە تایەکی تەرازووەکەو پسووڵە بچوکەکەش دەخەنە تایەکەی تری ، تۆمارە گەورەکان سوکتر دەبن و پسووڵە بچوکەکە قورستر دەبێت ، هیچ شتێ لەناوی اللّٰه تعالی قورستر نییە .

عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ يَقُولُ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ { ﷺ } : إِنَّ اللَّهَ سَيُخَلِّصُ رَجُلًا مِنْ أُمَّتِي عَلَى رُءُوسِ الْخَلَائِقِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيَنْشُرُ عَلَيْهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ سِجِلًّا، كُلُّ سِجِلٍّ مِثْلُ مَدِّ الْبَصَرِ، ثُمَّ يَقُولُ : أَتُنْكِرُ مِنْ هَذَا شَيْئًا ؟ أَظَلَمَكَ كَتَبَتِي الْحَافِظُونَ ؟ فَيَقُولُ : لَا يَا رَبِّ. فَيَقُولُ : أَفَلَكَ عُذْرٌ ؟ فَيَقُولُ : لَا يَا رَبِّ. فَيَقُولُ : بَلَى، إِنَّ لَكَ عِنْدَنَا حَسَنَةً، فَإِنَّهُ لَا ظُلْمَ عَلَيْكَ الْيَوْمَ. فَتَخْرُجُ بِطَاقَةٌ فِيهَا : أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ. فَيَقُولُ : احْضُرْ وَزْنَكَ. فَيَقُولُ : يَا رَبِّ، مَا هَذِهِ الْبِطَاقَةُ مَعَ هَذِهِ السِّجِلَّاتِ ؟ فَقَالَ : إِنَّكَ لَا تُظْلَمُ. قَالَ : فَتُوضَعُ السِّجِلَّاتُ فِي كَفَّةٍ، وَالْبِطَاقَةُ فِي كَفَّةٍ، فَطَاشَتِ السِّجِلَّاتُ، وَثَقُلَتِ الْبِطَاقَةُ، فَلَا يَثْقُلُ مَعَ اسْمِ اللَّهِ شَيْءٌ .
{ سنن الترمذي ٢٦٣٩ }

شایەتی دان بە ( لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ الله ) ئاگرت لەسەر حەرام دەکات :
لە الصنابحي یەوە ـ لە عبادة کوڕی الصامت ـەوە ( رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ) ـ دەڵێ: چووم بۆ لای لەسەرەمەرگدا بوو، دەستم کرد بەگریان، ووتی : ئارام بە، بۆچی دەگریت ؟ سوێند بە اللّٰه ئەگەر شەهیدبووم شایەتیت بۆ دەدەم، ئەگەر شەفاعەتم بۆکرا بۆت دەکەم، ئەگەر توانیم سوودت پێدەگەیەنم، ئینجا ووتی : سوێند بە اللّٰه فەرموودەیەک نییە کە لە پێغەمبەری اللّٰه ـم { ﷺ } بیستبێ خێری ئێوەی تێدابێت بۆم نەگێڕابنەوە جگە لەیەک فەرموودە، ئەویش ئەمڕۆ بۆتان دەگێڕمەوە، منیش

**ئێستا مردن دەورەی داوم لە پێغمبەری اللّٰه ـم { ﷺ } بیستووە فەرموویەتی :**
**(هەرکەس شایەتیدا کە هیچ پەرستراوێک نییە بەحەق بۆ پەرستن تەنها اللّٰه تعالی نەبێت و محمدیش { ﷺ } ڕەوانەکراوی اللّٰه ـیە، اللّٰه ئاگری لەسەر حەرام دەکات .**

**عَنِ الصُّنَابِحِيِّ ، عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ، أَنَّهُ قَالَ : دَخَلْتُ عَلَيْهِ وَهُوَ فِي الْمَوْتِ، فَبَكَيْتُ، فَقَالَ : مَهْلًا لِمَ تَبْكِي ؟ فَوَاللَّهِ لَئِنِ اسْتُشْهِدْتُ لَأَشْهَدَنَّ لَكَ، وَلَئِنْ شُفِّعْتُ لَأَشْفَعَنَّ لَكَ، وَلَئِنِ اسْتَطَعْتُ لَأَنْفَعَنَّكَ. ثُمَّ قَالَ : وَاللَّهِ مَا مِنْ حَدِيثٍ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ { ﷺ } لَكُمْ فِيهِ خَيْرٌ إِلَّا حَدَّثْتُكُمُوهُ، إِلَّا حَدِيثًا وَاحِدًا، وَسَوْفَ أُحَدِّثُكُمُوهُ الْيَوْمَ، وَقَدْ أُحِيطَ بِنَفْسِي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ { ﷺ } يَقُولُ : مَنْ شَهِدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ النَّارَ .**
**{ صحيح مسلم ٢٩ }**

**ئایا شایەتی نەدەدا کە هیچ خوایەک نییە جگە لە (الله) :**
**لە محمودی کوڕی ربیع ـەوە( رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ) لە عتبان ـی کوڕی مالک ـەوە( رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ) بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ: هاتم بۆ مەدینە،**
**گەیشتم بە عتبان وتم: فەرموودەیەکم لەتۆوە پێگەیشتووە ، ووتی: چاوم تووشی شتێک بوو بوو، منیش ناردم بۆ لای پێغەمبەری اللّٰه { ﷺ } : کە من پێم خۆشە سەردانم بکەیت و، لەماڵی ئێمە نوێژ بکەیت، بۆئەوەی بیکەم بەجێ نوێژ ، دەڵێ: پێغەمبەر { ﷺ } لەگەڵ چەند کەسێک لەهاوەڵان هات و چووە ژوورەوەو، دەستی کرد بەنوێژکردن، هاوەڵانی لەناوخۆیاندا قسەیان دەکرد، زۆربەی باسەکەیان لەسەر مالک کوڕی دخشم بوو، وتیان: خۆزگە دەخوازین کە پێغەمبەر{ ﷺ } دوعای لێبکات و تیابچێت، خۆزگەشیان دەخواست تووشی شتێک ببێت. پێغەمبەر { ﷺ } لەنوێژەکەی بوویەوە، فەرمووی: (ئایا شایەتی نەدەدا کە هیچ خوایەک نییە شایەنی پەرستن بێت بە حەق جگە لە (اللّٰه)و منیش ڕەوانەکراوی ئەوم) ، وتیان: ئەو وادەڵێت، بەڵام لەدڵیەوە نایەت فەرمووی: کەس نییە شایەتی بدات کە جگە لە اللّٰه هیچ خوایەک نییەو، منیش پێغەمبەری اللّٰه ـم، بچێتە ئاگرەوە یان بیچەژێت .**
**ئەنەس ووتی: زۆر دڵخۆش بووم بەو فەرموودەیەو بەکوڕەکەمم ووت: بینووسە، ئەویش نووسی.**

حَدَّثَنِي مَحْمُودُ بْنُ الرَّبِيعِ ، عَنْ عِتْبَانَ بْنِ مَالِكٍ قَالَ : قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ، فَلَقِيتُ عِتْبَانَ، فَقُلْتُ : حَدِيثٌ بَلَغَنِي عَنْكَ. قَالَ : أَصَابَنِي فِي بَصَرِي بَعْضُ الشَّيْءِ، فَبَعَثْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ { ﷺ } أَنِّي أُحِبُّ أَنْ تَأْتِيَنِي، فَتُصَلِّيَ فِي مَنْزِلِي، فَأَتَّخِذَهُ مُصَلًّى. قَالَ : فَأَتَى النَّبِيُّ { ﷺ } وَمَنْ شَاءَ اللَّهُ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَدَخَلَ وَهُوَ يُصَلِّي فِي مَنْزِلِي، وَأَصْحَابُهُ يَتَحَدَّثُونَ بَيْنَهُمْ، ثُمَّ أَسْنَدُوا عُظْمَ ذَلِكَ وَكُبْرَهُ إِلَى مَالِكِ بْنِ دُخْشُمٍ. قَالُوا : وَدُّوا أَنَّهُ دَعَا عَلَيْهِ، فَهَلَكَ، وَوَدُّوا أَنَّهُ أَصَابَهُ شَرٌّ، فَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ { ﷺ } الصَّلَاةَ. وَقَالَ : أَلَيْسَ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ ؟ قَالُوا : إِنَّهُ يَقُولُ ذَلِكَ، وَمَا هُوَ فِي قَلْبِهِ. قَالَ : لَا يَشْهَدُ أَحَدٌ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، فَيَدْخُلَ النَّارَ، أَوْ تَطْعَمَهُ . قَالَ أَنَسٌ : فَأَعْجَبَنِي هَذَا الْحَدِيثُ. فَقُلْتُ لِابْنِي : اكْتُبْهُ، فَكَتَبَهُ.

{ صحيح مسلم ٣٣ }

مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ( رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ) دەفەرموێت: رَسُولُ اللَّهِ { ﷺ } فەرمووی: هەر کەسێک کۆتا وشەی( لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ اللَّه ) بێت دەچێتە بەهەشتەوە [ ئەمە لە کاتی مردنە ، واللّٰه اعلم ].

عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ { ﷺ } :
مَنْ كَانَ آخِرُ كَلَامِهِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ .

{ سنن أبي داود ٣١١٦ }

لە رَبِيعَةَ بْنِ عِبَادٍ الدِّيلِيِّ ، وە جاهلی بوو موسوڵمان بوو ، ووتی: رسول اللّٰه { ﷺ } ـمم بینی بە چاوم دەمبینی لە بازاڕی ذي المجاذ ـدا ، دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە بڵێن: لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ اللّٰه ، سەرفراز دەبن ، وە دەچووە ناو ڕێگاکانی نێوان شاخەکانی مەکەوە وە خەڵک لەسەری کۆدەبونەوە ، هیچ یەکێکم نەبینی شتێک بڵێ ، وە ئەویش پێغەمبەر { ﷺ } بێدەنگ نەدەبوو ، دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە بڵێن لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ اللّٰه ، سەرفراز دەبن .

عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ عِبَادٍ الدِّيلِيِّ - وَكَانَ جَاهِلِيًّا أَسْلَمَ - فَقَالَ : رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ { ﷺ } بَصَرَ عَيْنِي بِسُوقِ ذِي الْمَجَازِ، يَقُولُ : يَا أَيُّهَا النَّاسُ، قُولُوا : لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ؛ تُفْلِحُوا . وَيَدْخُلُ فِي فِجَاجِهَا وَالنَّاسُ مُتَقَصِّفُونَ عَلَيْهِ، فَمَا رَأَيْتُ أَحَدًا يَقُولُ شَيْئًا، وَهُوَ لَا يَسْكُتُ، يَقُولُ : أَيُّهَا النَّاسُ، قُولُوا : لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ؛ تُفْلِحُوا .

{ مسند لإمام أحمد ١٦٠٢٣ }

أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دەگێڕێتەوە ، دەڵێ: چومە لای پێغەمبەر{ ﷺ } جلێکی سپی لە بەردابوو ، وە ئەو خەوتبوو ، پاشان چومەلای خەبەری بویەوە ، فەرمووی: هیچ بەندەیەک نییە بڵێ: هیچ خوایەک نییە شایەنی پەرستن بێت بە حەق جگە لە اللّٰه ، پاشان لەسەر ئەوە بمرێ ئیللا دەچێتە بەهەشتەوە ، أَبِي ذَرٍّ دەڵێ ووتم: ئەگەر زینا بکات و دزیش بکات ؟ فەرمووی: ئەگەر زینا بکات و دزیش بکات ، ووتم: ئەگەر زینا بکات و دزیش بکات ؟ فەرمووی: ئەگەر زینا بکات و دزیش بکات ، ووتم ئەگەر زینا بکات و دزیش بکات ؟ فەرمووی: ئەگەر زینا بکات و دزیش بکات سەرەڕای پێناخۆش بوونی أَبِي ذَرٍّ . وە هەر کاتێک أَبِي ذَرٍّ ئەمەی دەگێڕایەوە دەیوت: وە ئەگەر أَبِي ذَرٍّ ـیش پێی ناخۆش بێت . باوکی عبداللّٰه ووتی: ئەمە لە کاتی مردنە یان پێش ئەوەیە ئەگەر تەوبە بکات و پەشیمان بێتەوە ، وە بڵێ: لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ اللّٰه ، اللّٰه لێی خۆش دەبێت .

أَنَّ أَبَا ذَرٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ حَدَّثَهُ، قَالَ : أَتَيْتُ النَّبِيَّ { ﷺ } وَعَلَيْهِ ثَوْبٌ أَبْيَضُ، وَهُوَ نَائِمٌ، ثُمَّ أَتَيْتُهُ وَقَدِ اسْتَيْقَظَ، فَقَالَ : مَا مِنْ عَبْدٍ قَالَ : لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ. ثُمَّ مَاتَ عَلَى ذَلِكَ، إِلَّا دَخَلَ الْجَنَّةَ . قُلْتُ : وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ ؟ قَالَ : وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ . قُلْتُ : وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ ؟ قَالَ : وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ . قُلْتُ : وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ ؟ قَالَ : وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ عَلَى رَغْمِ أَنْفِ أَبِي ذَرٍّ . وَكَانَ أَبُو ذَرٍّ إِذَا حَدَّثَ بِهَذَا قَالَ : وَإِنْ رَغِمَ أَنْفُ أَبِي ذَرٍّ. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ : هَذَا عِنْدَ الْمَوْتِ أَوْ قَبْلَهُ إِذَا تَابَ وَنَدِمَ، وَقَالَ : لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ. غُفِرَ لَهُ.

{ صحيح البخاري ٥٨٢٧ }

**دەڵێم: هەموو ئەم فەرموودانەو زیاتریش فەزڵ و گەورەیی واتای ( لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ اللّٰه ) دەردەخەن کە ئەگەر واتاکەیت زانی و مەرجەکانیت لە خۆتدا هێنایە جێ ئەوکاتە لێت وەر دەگیرێ و پێی دەچیتە بەهەشتەوە ، وە ئیللا تەنها ووتنی بە زمان و بە بێ زانینی واتاکەی و هەبوونی مەرجەکانی ئەوە هیچ سوودێک بە خاوەنەکەی ناگەیەنێک جا بۆیە بە جوانی وەک خۆی مەرجەکانی لە خۆتدا بێنە جێ و پارێزگاری لە تەوحیدەکەت بکە ، اللّٰه تعالی لە ئەهلی تەوحید حسێبمان بکات ، آمـــین .**

# مەرجەکانی لا إله إلا الله

**وەک لەم کورتە هۆنراوەیە ئاماژەی پێدراوە :**

**العلـم واليقين والقبــولُ والانقيــاد فادرِ ما أقــولُ**
**والصدق والإخلاص والمحبـة وفَّقك اللّٰه لما أحبـه**

**هەروەها مەرجی هەشتەم : الكَفَرَ بِمَا يُعْبَدُ مِنْ دُونِ اللَّهِ .**

**پاشان یەک یەک مەرجەکانی باس دەکەین و دەلیلەکانی لە قورئان و فەرمووده دەخەینە ڕوو بإذن اللّٰه تعالى :**

# مەرجی یەکەم : العلم ـ زانست

مەرجی یەکەمی ئەم ( لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ اللّٰه ) ـیە ئەوەیە کە بزانی واتای ( لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ اللّٰه ) چییە ، واتە هیچ خوایەک شایستەی پەرستن نییە ، هیچ بەردێک هیچ دارێک هیچ بۆچونێک هیچ فەلسەفەیەک هیچ ڕێبازێک هیچ داوا کاریەک لە خەڵکی لە مردوان و زیندووان ئەمانە هیچی جائیز نییە و شەریک پەیدا کردنە بۆ اللّٰه تعالی نابێ پەرستن بۆ هیچ یەک لەمانە بێت بەڵکو دەبێت تەنها بۆ اللّٰه بێت .

جا ئەم ئەمە یەکەم مەرجە کاتێک دەتەوێ بێیتە ناو حیزبی اللّٰه ـوە دەبێت بزانی و جاهیل نەبیت بە ( لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ اللّٰه ) وە دەبێ بزانی داوای چیت لێ دەکرێت ، وە اللّٰه حیزبی هەیە دەبێ شوێنی بکەویت وە نابێ شوێن هیچ حیزبێکی تر بکەویت ، تەنها حیزبی اللّٰه سەر فرازەو ڕزگار بووە هەر وەک چۆن اللّٰه تعالی دەفەرموێت:
[ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ] { المجادلة ٢٢ }
واتە : ئاگاداربن کە بەڕاستی هەر لایەن و حزب و دەستە و تاقمی اللّٰه سەرکەوتوو و سەرفرازن.

جا یەکەم مەرج کە داوات لێ کراوە زانستە ، هەر وەک چۆن اللّٰه تعالی دەفەرموێت: [ فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ ] { محمد ١٩ }
واتە: ئەی ئینسان !! دەی کەواتا چاک بزانەو دڵنیابە جگە لە اللّٰه ، هیچ خوایەکی ترنییە بە حەق کە شایەنی پەرستن بێت ، داوای لێخۆشبوونی گوناهـ بۆ خۆت بکە .

زانایان دەڵێن ( العلم بمعنا لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ نفياً وإثباتاً ) دوو شتت لێرەدا دانا نەفی شتێکت کردوو دانت بە شتێکیش دانا ، بە کورتی دەڵێیت نەخێر بۆ هەمووان بەڵێ بۆ اللّٰه .

هەروەها اللّٰه تعالی دەفەرموێت: [ إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ]
{ الزخرف ٨٦ }
واتە: مەگەر کەسێک کە شایەتی ڕاستی دابێت و بزانێت کێ شایستەی تکا بۆکردنە .

ئەهلی تەفسیر بۆ ئەم ئایەتە دەڵێن: وە مانای شەهادە دانی حەق شایەتیە بە ( لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ اللّٰه ) کە وشەی تەوحیدە ( وَهُمْ يَعْلَمُونَ ) واتە: بە دڵ و دەرونیان لەگەڵ ئەوە بن کە بە زمانیان دەریان بڕی [ واتە لە دڵیشەوە ڕازی بن بە واتای لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ اللّٰه واللّٰه اعلم ].

{ تفسير البغوي }

هەروەها لە فەرمودەش ئاماژەی پێ کراوە کە ئیمامی عُثمان بن عَفان ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرموێت: رسول اللّٰه { ﷺ } فەرمووی: هەر کەسێک مرد و وە زانی کە هیچ خوایەک نییە شایەنی پەرستن بێت بەحەق جگە لە اللّٰه ، دەچێتە بەهەشتەوە .

عَنْ عُثْمَانَ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ { ﷺ } : مَنْ مَاتَ، وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ . { صحيح مسلم ٢٦ }

کە واتە بە مەرج گیراوە لە قورئان و فەرمودەدا کە ئەو کەسەی دەبێت بە موسوڵمان و داخڵی ناو حیزبی اللّٰه تعالی دەبێت ، دەبێ بزانێ کە اللّٰه تعالی داوای چی لێ کردووەو واتای ( لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ اللّٰه ) بزانێ وەک ئەوەی کە باسمان کرد وە خۆی بە دوور بگرێ لە هەڵوەشاندنەوەی ئەم مەرجە کە نەزانینە (جهل) ، جا ئەگەر زانستی بە واتای( لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ اللّٰه ) هەبوو وە حەق و مافەکانی دا ئەوا مەرجێکی بەتەواوی جێبەجێ کردووە ، وە خۆی ڕزگار کردووە لە جەهل و نەزانین ، وە ئەگەر بەو شێوە نەبێت ئەوە لێی قەبوڵ ناکرێت و خەسارەتمەندی دونیاو قیامەت دەبێت ، جا بۆیە بزانە رحمک اللّٰه کە نابێ و ناگونجێ کە خۆت بە موسوڵمان بزانیت و جاهیل بیت بە واتای( لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ اللّٰه ) ئەوەی جاهیل بێت بە واتاکەی ئەوە بێگومان لە سەرەتاوە هەر نەهاتۆتە ناو ئیسلامەوە ، اللّٰه پەنامان بدات لە جەهل و نەزانین هەروەک :

ئیمامی الآجري(٣٦٠هـ) فەرموویەتی:

بزانە ڕەحمەتی اللّٰه ـت لێبێت ، من و تۆ لەسەردەمی فیتنە زۆریداین لەزۆر ڕووەوە ، ئەگەر مرۆڤ زانستی نەبێت بە ڕزگاربوون لە هەموو فیتنەیەک کە بەسەری دا دێت ئەوا بەڕاستی لەناو دەچێت .

{ كتاب فرض طلب العلم }

**کە وایە واجبە لەسەرت خۆت فێری زانستی شەرعی بکەیت و بزانی داوای چیت لێ کراوە وەکو خۆی جێبەجێی بکەیت ، ئەگەر نا لە ڕیزی تیا چووان دەبیت .**

# مەرجی دووەم : اليقين ـ دڵنیایی

دوای ئەوەی زانستت بە واتای( لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّه ) هەبوو ، ئەوە پێویستە لەسەرت کە ئەم مەرجەش کە (اليقين) واتە دڵنیایی کە پێچەوانەکەی گومانە لە خۆتدا جێبەجێ بکەیت ، ئەبێت دڵنیابیت سەدا سەد ، وە نابێ یەک زەڕە گومانت هەبێت ، گەر گومانت هەبێت لە کۆتایی کافری ، یان اللّٰه ـش بپەرستی و گومانت هەبێت لە ڕاستیەتی ئەم دینە کە دینی حەقە ئەوە تۆ کافری ، وەکو ئەوەی بڵێی من شوێنی دەکەوم ئەگەر ڕاست بوو ئەوە سەر بەرز دەبین ئەگەر ڕاستیش نەبوو ئەوە خۆ هیچمان لە دەست دەرناچێ ! ئەمە گومانە نابێت .

بەڵکو دەبێ بڵێی اللّٰه تعالى دەپەرستم و ئیمانم هەیە کە بەهەشت و جەهەنەمی هەیەو ئەوەی بە قسەی نەکات دەیخاتە ناو جەهەنەم و ئەوەشی بە قسەی بکات دەیخاتە بەهەشتەکەیەوە ، دەبێت یەقینت هەبێ کە ئەم دینە دینی ڕاستەو کامڵەو تەواوەو هیچ کەم و کوڕیەکی نییە هەروەک چۆن اللّٰه تعالى دەفەرموێت:

[ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ ] { الصف ٩ }

واتە: اللّٰه ئەو زاتەیە کە پەیامبەرەکەی خۆی محمد { ﷺ } بەقورئانێکی ڕێنموونیکارو ئایینێکی حەق و ڕاست و ڕەوانەوە نارد بۆ ئەوە بەسەر تەواوی ئایینەکاندا سەری بخات ، ئەگەرچی موشریک و هاوبەش پەیداکەرانیش پێیان ناخۆش بێ و، هەوڵی کوژانەوەی بدەن.

کەوایە بزانە دینی حەق تەنها دینی ئیسلامەو هەر ئەویش پەسەندە لای اللّٰه تعالى و نابێ هیچ گومانت لە ڕاستێتی ئەم دینە هەبێت ، وە دەبێ دڵنیابیت کە ئەم دینە دینی حەق و ڕاستەو غەیری ئەم دینەش هیچ دینێکی تر پەسەند نییە و هەموو ئاین و دینەکانی تر بە هاتنی ئیسلام نەسخ بونەوەو نابێت پەیڕەویان لێ بکرێ هەر وەک اللّٰه تعالى دەفەرموێت:

[ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ]
{ آل عمران ٨٥ }
واتە: هەركەسێ بێجگە لەبەرنامەو شەریعەتی ئیسلام هەردینێک بۆخۆی هەڵبژێرێ و بیكا بەبەرنامەی خۆی هەرگیز لێیوەرناگیردرێ و لەدوارۆژیشدا لەڕیزی زیانمەندانە.

كەواتە بێ هیچ گومانێک ئەم دینە وەر بگرەو ئاسوودە بە اللّٰه تعالى ـیش دەفەرموێت: [ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا ]
{ الحجرات ١٥ }
واتە: بێگومان ئیمانداراني ڕاست ئەوانەن كەباوەڕیان بە اللّٰه ـو پێغەمبەری اللّٰه هێناوە و پاشان نەكەوتوونەتە هیچ گومان و دوودڵیەكەوە .

لە تەفسیری [ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا ] ئیمامی الطبري(٣١٠هـ) لە تەفسیرەكەی دەڵێ: پاشان هیچ گومانیان لە بەیەكدانانی اللّٰه تعالى نەبووە ، وە گومانیشیان لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر { ﷺ } نەبووە ، وە نەفسیان ملكەچی گوێڕایەڵی اللّٰه وە گوێڕایەڵی پێغەمبەرەكەی كردووە ، وە كردەوەیان بەوە كردووە كە واجب كراوە لەسەریان لە فەرزەكانی اللّٰه تعالى بە بێ هیچ گومانێک لە ئەوەوە لە واجب بوونی ئەمە لەسەریان .
{ تفسير الطبري }

گومان نابێت لە دڵتدا دروست ببێ ئەگەر گومان هەبوو لە دڵتدا لەم دینە ئەوە تۆ هەر نەهاتویتە ناو دینەكەوە ، بەڵكو دەبێت بیلێیت و لە دڵیشتدا وابێ چۆن ئەزانی بۆ نمونە ئەوە بەردە یان ئەوە مرۆڤە یان ئەوە شاخە  دەبێت بەم شێوەیە بیلێیت و لە دڵتدا وابێت كە ئەم دینە حەقە وە بەهەشت و جەهەنەم حەقە .

پاشان اللّٰه تعالى لە كۆتایی هەمان ئایەت دەفەرموێت:
[ وَجَٰهَدُوا بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أُولَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ] { الحجرات ١٥ }
واتە: بەخۆیان و سەرو ماڵیشیانەوە تێكۆشاون لەپێناوی ئاینی اللّٰه ـدا، تەنها ئا ئەوانە ڕاستن .

الطبري (٣١٠ هـ) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا [ أُولَئِكَ هُمُ ٱلصَّدِقُونَ ] دەڵێ: ئەوانە ئەو کەسانە بوون ئەمەیان ئەنجام دەدا وە ئەوان ڕاستگۆبوون لە وتەکانیان: ئێمە ئیمانداراین ، نەک ئەو کەسەی چووەتە ناو ئیسلامەوە لەترسی شمشێر بۆ پاراستنی خوێن و ماڵی .

هەروەها الطبري(٣١٠ هـ) دەڵێ : یونس بۆی گێڕامەوە ، ووتی: ابن وهب(١٩٧ هـ) هەواڵی پێداین ، ووتی: ابن زيد(١٨٢ هـ) دەربارەی وتەی اللّٰه تعالی: [ أُولَئِكَ هُمُ ٱلصَّدِقُونَ ] فەرمووی: ڕاستیان کرد لەگەڵ ئیمانەکەیان بە کردەوەکانیان .
{ تفسير الطبري }

وە لە فەرمودەی أبي هريرة ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) هاتووە کە پێغەمبەر { ﷺ }
فەرموویەتی: شایەتی دەدەم کە هیچ خوایەک نییە شایەنی پەرستن بێت بە حەق جگە لە اللّٰه ، وە منیش نێردراوی اللّٰه ـم ، هەر بەندەیەک بەم دوو وتەیەوە بگەڕێتەوە بۆ لای اللّٰه و بە بێ ئەوەی گومانی تێیاندا هەبێ ، ئیللا دەچێتە بەهەشتەوە .

عن أبي هريرة رضي اللّٰه عنه قال : قال رسول اللّٰه { ﷺ } : أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، لَا يَلْقَى اللَّهَ بِهِمَا عَبْدٌ غَيْرَ شَاكٍّ فِيهِمَا إِلَّا دَخَلَ الْجَنَّةَ .
{ صحيح مسلم ٢٧ }

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا لە أبي هريرة( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) هاتووە ، کە پێغەمبەر { ﷺ } پێی فەرموو: ئەی أبا هريرة هەرکەست بینی لە پشت ئەم دیوارەوە شایەتی بدات کە هیچ خوایەک نییە شایەنی پەرستن بێت بە حەق جگە لە اللّٰه ، بەدڵ باوەڕی بەوە هەبێت ئەوە مژدەی بەهەشتی بدەرێ .

قال رسول اللّٰه { ﷺ } يَا أَبَا هُرَيْرَةَ فَمَنْ لَقِيتَ مِنْ وَرَاءِ هَذَا الْحَائِطِ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ مُسْتَيْقِنًا بِهَا قَلْبُهُ، فَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ .{ صحيح مسلم ٣١ }

هەروەها مُعاذ بن جبل ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرموێت : رسول اللّٰه { ﷺ }
فەرموویەتی: هیچ نەفسێک نییە بمرێت و شایەتی دابێت بەوەی هیچ خوایەک نیە شایەنی پەرستن بێت بەحەق جگە لە اللّٰه تعالی نەبێت ، وە منیش نێردراوی اللّٰه تعالی ـم ، گەڕابێتەوە بەمەوە یەقینی هەبێت لە دڵیدا[ واتە گومانی نەبێت] ئیللا اللّٰه لێی خۆش دەبێت .

عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ { ﷺ }: مَا مِنْ نَفْسٍ تَمُوتُ، تَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ { ﷺ }، يَرْجِعُ ذَلِكَ إِلَى قَلْبِ مُوقِنٍ إِلَّا غَفَرَ اللَّهُ لَهَا .
{ سنن ابن ماجه ٣٧٩٦ }

کەواتە تۆی موسوڵمان دەبێت یەقینت هەبێت لەم دینەی کە لە ناویدایت بەوەی کە دینی ڕاست و حەقەو سەرفرازی قیامەت تەنها لەم دینەیە و هیچ گومانت لێی نەبێت ئەو کاتە اللّٰه تعالی لێتی وەر دەگرێت ، وە ئەگەر زەڕە گومانت هەبێت ئەو کاتە اللّٰه تعالی هیچت لێ وەر ناگرێت و لە ڕیزی زەرەرمەندان دەبیت .

# مەرجی سێیەم : الإخلاص ـ نییەت پاکی

ئەوەیە کە تۆ هەموو شتێکت لە پێناوی اللّٰه تعالی بێت نابێت لە پێناوی مرۆڤەکان بێت ، ئەمەش پێی دەوترێت الإخلاص ( الإخلاص منافي للشرك ) واتە الإخلاص پێچەوانەکەی شیرکە ، کەواتە تۆ نابێت شەریک بۆ اللّٰه بریار بدەیت دەبێت بە پاکی و بەبێ شەریک اللّٰه تعالی بپەرستی ، وە پوختەی کارو کردەوەکانت لە پێناو اللّٰه تعالی بێت ، واتای ئەوەیە کە هەموو کارو کردەوەکانت پوختی بکەیتەوە تەنها لە پێناو اللّٰه تعالی بێت ( وحده لا شرك له ) هیچی سەرف نەکەیت بۆ غەیری اللّٰه ، نوێژ ، ڕۆژوو ، زەکات ، حەج ، دووعا و پاڕانەوەو نەزر کردن ، وە سەدەقاتەکانت هەمووی لە پێناو اللّٰه تعالی بێت ، شتێک سەرف بکەیت بۆ غەیری اللّٰه دەبیتە موشریک واتە اللّٰه ـت پەرستووەو غەیری اللّٰه ـشت پەرستووە ، اللّٰه تعالی لێت قەبوڵ ناکات بەم شێوەیە .

اللّٰه تعالی دەفەرموێت: [ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ فَٱعْبُدِ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ] { الزمر ٢ }
واتە: بێگومان ئێمە ئەم قورئانەمان ڕەوانە کردووە بۆ تۆ ئەی پێغەمبەر { ﷺ } تا حەق و ڕاستی ڕوون بکاتەوە ، کەواتە هەر اللّٰه  بپەرستە و هەر ملکەچ و دڵسۆزبە بۆ ئاین و بەرنامەکەی.

الطبري(٣١٠ هـ) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێ: محمد بۆی گێڕاینەوە ، ووتی: أحمد بۆی گێڕاینەوە ، ووتی: أسباط بۆی گێڕاینەوە ، لە السدي(١٢٧ هـ) دەربارەی وتەی اللّٰه تعالی: [ مُخْلِصًا لَهُ الدِّينَ ] فەرموویەتی: تەوحید و دیـــن ڕاوەستاوە بەجێگیربوونی ئەوەی کە نیەتت تەنها بۆ اللّٰه بێت(واتە موەحید بیت) لەسەری . { تفسير الطبري }

هەروەها اللّٰه تعالی دەفەرموێت: [ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلْخَالِصُ ] { الزمر ٣ }
واتە: ئاگاداربن: دینی پاک و خاوێن تەنها بۆ اللّٰه ـیە .

الطبري(٣١٠ هـ) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: [ أَلا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ ] دەڵێ: اللّٰه تعالی پێی ڕاگەیاندین: ئاگاداربە عیبادەت و گوێڕایەڵی بۆ اللّٰه ـیە بەتەنها شەریکی نیە ، بە خالیصی بۆ هیچ کەسێک نیە شەریک بێت لەگەڵ اللّٰه ـدا تێیدا ( واتە لە عیبادەت و گوێڕایەڵی ) جا ئەوە پێویست نییە بۆ هیچ کەسێک لەبەر ئەوەی هەرچی لە غەیری اللّٰه ـیە موڵکی ئەوە وە لەسەر بەندەیە گوێڕایەڵی خاوەنەکەی بکات نەک ئەو کەسەی هیچ شتێکی بەدەست نییە و خاوەنی هیچ شتێک نیە ، وە بەو شێوەیەی وتمان دەربارەی ئەوە ئەهلی تەفسیر قسەیان کردووە .

هەروەها الطبري(٣١٠ هـ) دەڵێ: بشر بۆی گێڕاینەوە ، ووتی: يزيد بۆی گێڕاینەوە ، ووتی: سعيد بۆی گێڕاینەوە ، لە قتادة(١١٨ هـ) دەربارەی وتەی اللّٰه تعالی: [ أَلا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ ] فەرمووی: واتە شایەتی دان بە لَآ إِلَهَ إِلَّا اللّٰه [ واتە هیچ خوایەک نییە شایەنی پەرستن بێت بە حەق جگە لە اللّٰه ] .
{ تفسير الطبري }

هەروەها اللّٰه تعالی دەفەرموێت: [ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ ] { البينة ٥ }
واتە: فەرمانیشیان پێنەدرابوو جگە بەوەی کە خواپەرستی بکەن و بەپاکی و دڵسۆزی و ملکەچی  فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەکە بن و لابدەن لە هەموو ئایینێک و تەنها پابەندی ئاینی ئیسلام بن .

وە لە ئایەتێکی تردا اللّٰه تعالی دەفەرموێت: [ هُوَ ٱلۡحَيُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۗ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ] { غافر ٦٥ }
واتە: ئەو زاتە هەمیشە و بەردەوام هەر زیندووە ، جگە لەو خوایەکی تر نییە، کەوابوو هانا و هاوار و نزاتان ڕوو بەو بێت ، ملکەچ و فەرمانبەرداری بەرنامە و ئاینەکەی ئەو بن ، سوپاس و ستایش بۆ اللّٰه ، کە پەروەردگاری هەموو جیهانیانە .

هەروەها أبي هريرة ( رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ) دەفەرموێت: ووتم ئەی پێغەمبەری اللّٰه { ﷺ }
کێ بەختەوەرترین کەسە بە شەفاعەت و تکای تۆ لە ڕۆژی قیامەتدا ؟ فەرمووی: أبو
هريرة ، خۆشم گومانم هەروا بوو کە کەس لە پێش تۆدا ئەمەم لێ نەپرسێ وە تۆ
یەکەم کەس بی کە ئەم پرسیارەم لێ بکەی ، چونکە دەتبینم ئەوەندە حەریس و
سووریت لەسەر فەرمووده : لە ڕۆژی قیامەتدا بەختەوەرترین کەس بە شەفاعەتی
من ئەو کەسەیە کە دەڵێ :
هیچ خوایەک نییە شایەنی پەرستن بێت بە حەق جگە لە اللّٰه ،
بە نیەتێکی پاکەوە لە دڵیەوە یان لە نەفسیەوە .

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ قَالَ : قِيلَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَنْ أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ؟
قَالَ رَسُولُ اللَّهِ { ﷺ } : لَقَدْ ظَنَنْتُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَنْ لَا يَسْأَلَنِي عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ أَحَدٌ
أَوَّلُ مِنْكَ، لِمَا رَأَيْتُ مِنْ حِرْصِكَ عَلَى الْحَدِيثِ، أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنْ
قَالَ : لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ خَالِصًا مِنْ قَلْبِهِ أَوْ نَفْسِهِ .
{ صحيح البخاري ٩٩ }

وە بزانە هەموو کردەوەیەکی تۆ دەبێت لەسەر ئەم عەقیدەیە بێت ئاگاداربە وە
شەو و ڕۆژ تۆ ئەمە ببیستە لێی بێتاقەت مەبە چونکە ئەگەر ئەمەت نەبێ ( واتە
نییەتت تەنها بۆ اللّٰه نەبێت ) هەموو کارو کردەوەت بە فیڕۆ دەچێ وە هەموو
پێغەمبەران علیهم السلام بۆ ئەوە هاتوون وە شتەکە زۆر گەورەیە گاڵتە نییە ،
دەبێت پەرستشەکانت تەنها بۆ اللّٰه بێت و هیچ کەسێکی تر نەیکەتە هاوبەشی
ئەگینا ڕەنج بە خەسار دەبیت لە قیامەتدا و کەسیش بە هاناتەوە نایەت لەوانەی کە
کردووتن بە هاوبەشی اللّٰه تعالی جا بۆیە با کارو کردەوەو عیبادەتەکانت تەنهاو
تەنها لە پێناو اللّٰه تعالی بێت ، ئەگەر نا هیچی وەرناگیرێ لێت .

# مەرجی چوارەم : الصدق ـ ڕاستگۆیی

ئەم مەرجە باسی ڕاستگۆیی دەكات دەبێت ڕاست بكەیت لەگەڵ ووتنی ( لَآ إِلَهَ إِلَّآ اللّٰه )ـكەت و درۆ نەكەیت و دووڕوو نەبیت لە ناوەوە ڕقت لە اللّٰه و پێغەمبەری اللّٰه { ﷺ } بێت ، لە دەریشەوە بێیت لەگەڵ موسوڵماناندا دابنیشیت و بڵێیت من موسوڵمانم ! دەبێت لە ناوەوەو لە دەرەوە ڕاست بكەیت لەگەڵ شەهادە هێنانەكەت .

كەسی موسوڵمان دەبێت ڕاستگۆ بێت لەگەڵ شەهادەتی( لَآ إِلَهَ إِلَّآ اللّٰه ) وە بە زوبان و دڵ و كردەوەی لەگەڵی بێت ، نەک وەک دووڕووەكان كاتێک لای ئیماندارەكان بوون دەیان ووت لەگەڵ ئێوەین وە كاتێک دەچونە لای كافرەكان دەیان ووت ئێمە هەر لەگەڵ ئێوەبوین و گاڵتەمان بەوان كرد ، وەک چۆن اللّٰه تعالی دەربارەیان دەفەرموێت: [ وَإِذَا لَقُوا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا قَالُوٓا ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡا إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ قَالُوٓا إِنَّا مَعَكُمۡ إِنَّمَا نَحۡنُ مُسۡتَهۡزِءُونَ ] { البقرة ١٤ }
واتە: كاتێكیش (دووڕووەكان) دەگەن بەوانەی باوەڕیان هێناوە دەڵێن: ئێمە ئیماندارین و باوەڕمان هێناوە!!، كەچی كاتێک بە تەنها دەمێننەوە لە لای شەیتانە گەورە و فێڵبازەكانیان دەڵێن: بەڕاستی ئێمە لەگەڵ ئێوەین، بێگومان ئێمە تەنها گاڵتەیان پێدەكەین و پێیان ڕادەبوێرین!!

هەروەها كەسی موسوڵمان نابێ درۆ بكات لەگەڵ شەهادەی ( لَآ إِلَهَ إِلَّآ اللّٰه ) چونكە ئەمە سیفەتی دووڕووەكانە ، وەک چۆن اللّٰه تعالی دەفەرموێت: [ إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ قَالُوا نَشۡهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ] { المنافقون ١ }
واتە: ئەی پێغەمبەر { ﷺ } كاتێک ناپاک و دووڕووەكان دێن بۆ لات و دەڵێن: ئێمە شایەتی دەدەین كە تۆ پێغەمبەری اللّٰه ـیت!! لەحاڵێكدا كە اللّٰه خۆی چاک دەزانێت كە تۆ پێغەمبەر و نێردراوی ئەویت، لە هەمان كاتدا، اللّٰه شایەتی دەدا كە ئەو ناپاک و دووڕووانە درۆزنن.

جا بزانە ڕاستگۆیی مەرجە بۆ وەر گرتنی شەهادەتی ( لَآ إِلَهَ إِلَّآ اللّٰه ) بەبێ ڕاستگۆیی لێت وەر ناگیرێت ، اللّٰه تعالى ـش دەفەرموێت: [ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ {٢} وَلَقَدۡ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَٰذِبِينَ{٣}] { العنكبوت ٢-٣ }
واتە: ئایا خەڵکی وایانزانیوە، وازیان لێدەهێنرێت و پشتگوێ دەخرێن کە بڵێن ئیمان و باوەڕمان هێناوە، لەکاتێکدا ئەوان تاقی نەکرێنەوە و تووشی سزا و ئازار نەکرێن؟ سوێند بە اللّٰه بێگومان ئێمە ئەوانەی پێش ئەمانمان تاقیکردۆتەوە بە جۆرەها شێوە، تا اللّٰه تعالى (لە جیهانی واقیعدا) ئەوانەی ڕاستیان کردووە بیانناسێت و دەرکەون، هەروەها درۆزنەکانیش دەبێت بناسێت و دەرکەون.

هەروەها لە ئایەتێکی تردا اللّٰه تعالى دەفەرموێت: [ فَأَمَّا مَنۡ أَعۡطَىٰ وَٱتَّقَىٰ {٥} وَصَدَّقَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ {٦} فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡيُسۡرَىٰ {٧} ] { الليل ٦-٧ }
واتە: ئینجا ئەوەی ماڵ و سامانی خۆی لەبەر اللّٰه بەخشی و لە نافەرمانی اللّٰه خۆی پاراست و بڕوای بە پاداشتی چاکتر کرد ، ئەوا ئێمەش بێگومان بۆ بەهەشت و بۆ کاری ئاسان و چاک ئامادەو ڕێنوینی دەکەین ، دەخەینە سەر راستە ڕێ .

الطبري (٣١٠ هـ) لە تەفسیرەکەیدا هێناویەتی لە ابن عباس(٦٨ هـ) ، وە أبي عبد الرحمن (٧٤ هـ) ، وە الضحاک(١٠٥ هـ) دەربارەی وتەی اللّٰه تعالى : [ وَصَدَّقَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ] دەفەرموون : ڕاستگۆ بێت بە لَآ إِلَهَ إِلَّآ اللّٰه .
{ تفسير الطبري }

هەروەها لە فەرمودەش هاتووە کە أنس بن مالک ( رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ) فەرموویەتی: جارێ موعاذ لە پاشکۆی پێغەمبەرەوە سوار دەبێ ، پێغەمبەر { ﷺ } دەفەرموێت: ئەی موعاذ ! موعاذ دەڵێ ، بفەرموو ئەی پێغەمبەری اللّٰه { ﷺ } وا لە خزمەتتدام سەرم لە ڕێتایە ، پێغەمبەر { ﷺ } سێ جار وا بانگی دەکات ، موعاذیش هەر سێ جارەکە وا وەڵامی دەداتەوە ، جا پێغەمبەر { ﷺ } دەفەرموێت: هیچ کەسێک نییە کە شایەتی بدات کە هیچ خوایەک نییە شایەنی پەرستن بێت بە حەق جگە لە اللّٰه ، وە

منیش محمد پێغەمبەری اللە ـم ، بەڕاستگۆیانە لە دڵیەوە ، ئیللا اللّٰه ئاگری لەسەر حەرام دەکات ، موعاذ دەڵێ: یا رسول اللّٰه { ﷺ } ئایا ئەم مژدە خۆشە بە موسوڵمانان ڕابگەیەنم تا خۆشییان تێ بکەوێت ؟ فەرمووی: ئاخر پشت بەم مژدەیە دەبەستن و لە کردەوەی باش سارد دەبنەوەو پشتی لێ دەکەن ، بەڵام موعاذ لە کاتی سەرەمەرگیدا ئەم فەرموودەیەی ڕاگەیاندو گێڕایەوە بۆ موسوڵمانان ، نەکا بەشاردنەوەی و ڕانەگەیاندنی گوناهبار ببێ .

حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ أَنَّ النَّبِيَّ { ﷺ } - وَمُعَاذٌ رَدِيفُهُ عَلَى الرَّحْلِ - قَالَ : يَا مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ . قَالَ : لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ، قَالَ : يَا مُعَاذُ . قَالَ : لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ - ثَلَاثًا - قَالَ : مَا مِنْ أَحَدٍ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ صِدْقًا مِنْ قَلْبِهِ، إِلَّا حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ . قَالَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَلَا أُخْبِرُ بِهِ النَّاسَ فَيَسْتَبْشِرُوا ؟ قَالَ إِذَنْ يَتَّكِلُوا . وَأَخْبَرَ بِهَا مُعَاذٌ عِنْدَ مَوْتِهِ تَأَثُّمًا .
{ صحيح البخاري ١٢٨ }

کەوایە بزانەو ئاگادار بە کە ڕاستگۆیی مەرجە بۆ وەرگرتنی شەهادەتی ( لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ اللّٰه ) وە بەبێ ڕاستگۆیی اللّٰه تعالى لێت وەر ناگرێت ، وە بزانە کە پێچەوانەی ڕاستگۆیی درۆکردنە کەواتە نابێت درۆ لەگەڵ ئەم شەهادەیەدا بکەیت پێویستە زوبان و دڵ و کردەوەت یەک بێت و ڕاستگۆ بیت لە بەرامبەر دینەکەت و دوو ڕوو نەبیت بۆ ئەوەی لە قیامەت لەڕیزی بەختەوەران بیت نەچیتە ڕیزی تیاچوانەوە .

# مەرجی پێنجەم : المحبة ـ خۆشویستن

دەبێت هەموو بەشێکی دینت خۆش بوێت و هەرچی لەناو ئەم وشەیەدایە کە ( لَاْ إِلَٰهَ إِلَّاْ اللّٰه )ـیە خۆشت بوێت ، وە اللّٰه و پێغەمبەرت { ﷺ } خۆش بوێت ، وە هەر کەسێکیش لە شوێنکەوتوانی دینی ئیسلام بوو لە هەر شوێنێک بوو لە زەوی یاخود لە ئاسمان دەبێت خۆشت بوێت وە هەر چی پەیوەندی بە اللّٰه ـوە بوو دەبێت خۆشت بوێت خۆشت نەوێت کافری ، ڕقت لە موسوڵمانێک بێت کافری لەبەر ئیسلامەتیەکەی ئاگاداربە نەک لەبەر ئەخلاقێکی ناشرینی ، من موسوڵمانێک ڕقم لێیەتی لەسەر ئەوەی درۆ دەکات بەڵێ لەبەر ئەم درۆیە ڕقم لێتە بەس بە گشتی نا لەبەر ئەوەی تۆ موسوڵمانی خۆشم دەوێیت و ئیسلامەتیەکەتم خۆش دەوێت بەڵام ئەم خاڵەو ئەو خاڵە ڕقم لێیەتی چونکە لەم خاڵەو لەوخاڵە پابەند نەبووی بە دینی اللّٰه تعالی ـوە .

گەر تۆ بڵێی من اللّٰه ـم خۆش دەوێت و پێغەمبەرم { ﷺ } خۆشدەوێت و نوێژ دەکەم و ڕۆژوو دەگرم عیبادەتی بۆ دەکەم و خوێنی خۆمی لە پێناو دەڕێژم بەڵام ڕقم لە جبریلە (علیه السلام) اللّٰه تعالی دەفەرموێت تۆ کافری و هەتا هەتایەش لە دۆزەخ نایەیتە دەرەوە ، [ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبۡرِيلَ وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلۡكَٰفِرِينَ ] { البقرة ٩٨ }

واتە: ئەو کەسەی دوژمن بێت بە اللّٰه و فریشتەکانی و پێغەمبەرەکانی، بەتایبەت جوبرەئیل و میکائیل، ئەوە با بزانێت و دڵنیا بێت کە اللّٰه تعالی دوژمنی کافرو بێباوەڕانە .

هەروەها اللّٰه تعالی دەفەرموێت: [ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ {٣١} قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡكَٰفِرِينَ {٣٢} ] { آل عمران ٣١-٣٢ }

واتە: (ئەی پێغەمبەر { ﷺ } بە ئیمانداران) بڵێ: ئەگەر ئێوە اللّٰه ـتان خۆش دەوێت دە شوێنی من بکەون و لە فەرمانی من دەرمەچن، ئەوکاتە اللّٰه ـیش ئێوەی خۆش

دەوێت و لە گوناهو هەڵەکانیشتان خۆش دەبێت، ئەو اللّٰه ـیە لێخۆشبوو و میهرەبانە ، (دووبارە) پێیان بڵێ: فەرمانبەرداری اللّٰه و پێغەمبەر بن، خۆ ئەگەر سەرپێچی بکەن و پشتی تێبکەن ئەوە دڵنیابن اللّٰه بێ باوەڕانی خۆش ناوێت.

هەروەها اللّٰه تعالی دەفەرموێت: [ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ إِذْ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ ] { البقرة ١٦٥ }

واتە: (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە ئاشکرایانەدا) هەندێک کەس هەیە لەجیاتی ئەوەی اللّٰه پەرست بێت، شتانی تر دادەتاشێت بۆ خۆی و (شوێن ڕێنموویيەکانی اللّٰه ناکەوێت) و خۆشەویستی و سۆزی دەدات بەو بت و بەرنامۆلکە و توولە ڕێگەیانە و خۆشی دەوێن، وەك چۆن ئیمانداران اللّٰه ـیان خۆش دەوێت، بەڵام ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە زۆر زیاتر اللّٰه ـیان خۆش دەوێت (هەر بەراورد ناکرێت) جا ئەوانەی کە ستەمیان کردووە گەر دەیانزانی لە کاتێکدا کە بەچاوی خۆیان ڕووبەڕووی ئەو سزایە دەبنەوە، کە بەڕاستی بۆیان دەردەکەوێت کە هێزو تواناو دەسەڵات هەر هەمووی بە دەست اللّٰه ـیە و دڵنیا دەبوون کە ئەو اللّٰه ـیە سزاکەی زۆر بە ئازارە (بۆ ستەمکاران).

وە لە ئایەتێکی تردا اللّٰه تعالی دەفەرموێت: { يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ } { المائدة ٥٤ }

واتە: ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە! هەرکەسێکتان لەئایینی خۆی، واتە: لەدینی ئیسلام پاشگەز بێتەوەو وەرگەڕێ ، جا اللّٰه لەمەولا کەسانێک دێنێت، ئەوەندە بەرفەرمانی دەبن خۆشی دەوێن و، ئەوانیش ئەویان خۆشدەوێ .

هەروەها لە فەرموودەش هاتووە أنس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دەفەرموێت: پێغەمبەری اللّٰه { ﷺ } فەرموویەتی: سێ شت هەن هەر کەس تێیدابێت بەو سیانە شیرینی ئیمان بەدەست دەهێنێ، هەرکەس اللّٰه و پێغەمبەر{ ﷺ }ـی لەهەموو شت خۆشتر بووێت، هەروەها کەسێکی خۆشویست تەنها لەبەر اللّٰه خۆشی بووێت، ئینجا پێی ناخۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ کوفر ــ دوای ئەوەی اللّٰه ڕزگاری کرد لێی وەکو چۆن پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتە ناو ئاگرەوە .

عَنْ أَنَسٍ ، عَنِ النَّبِيِّ { ﷺ } قَالَ : ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ بِهِنَّ حَلَاوَةَ الْإِيمَانِ : مَنْ كَانَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لَا يُحِبُّهُ إِلَّا لِلَّهِ، وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ بَعْدَ أَنْ أَنْقَذَهُ اللَّهُ مِنْهُ، كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ .
{ صحيح مسلم ٤٣ }

وە البراء بن عازب (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دەفەرموێت: ئێمە دانیشتبوین لە لای پێغەمبەر { ﷺ } پێی فەرمووین: کامە دەستگیر لە دەستگیرەکانی ئیسلام بتەوترینە ؟ وتیان: نوێژە ، فەرمووی: نوێژ باشە ، وە ئەمە چی تێدایە ؟ وتیان: زەکاتە ، فەرمووی: زەکات باشە ، وە ئەمە چی تێدایە ؟ وتیان: ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانە ، فەرمووی: ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان باشە ، وە ئەوە چی تێدایە ؟ وتیان: حەجکردنە ، فەرمووی: حەجکردن باشە ، وە ئەوە چی تێدایە ؟ وتیان: جیهاد کردنە ، فەرمووی: جیهاد کردن باشە ، وە ئەوە چی تێدایە ؟ دواتر فەرمووی: بێگومان بتەوترینی دەستگیرەکانی ئیمان ئەوەیە کە خۆشویستنت لە پێناو اللّٰه بێت ، وە ڕقلێبونەوەشت لە پێناو اللّٰه بێت .

عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ، قَالَ : كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ النَّبِيِّ { ﷺ } فَقَالَ : أَيُّ عُرَى الْإِسْلَامِ أَوْثَقُ ؟ . قَالُوا : الصَّلَاةُ. قَالَ : حَسَنَةٌ، وَمَا هِيَ بِهَا ؟ . قَالُوا : الزَّكَاةُ. قَالَ : حَسَنَةٌ، وَمَا هِيَ بِهَا ؟ . قَالُوا : صِيَامُ رَمَضَانَ. قَالَ : حَسَنٌ، وَمَا هُوَ بِهِ ؟ . قَالُوا : الْحَجُّ. قَالَ : حَسَنٌ، وَمَا هُوَ بِهِ ؟ . قَالُوا : الْجِهَادُ. قَالَ : حَسَنٌ، وَمَا هُوَ بِهِ ؟ . قَالَ : إِنَّ أَوْسَطَ عُرَى الْإِيمَانِ أَنْ تُحِبَّ فِي اللَّهِ، وَتُبْغِضَ فِي اللَّهِ .
{ مسند الإمام أحمد ١٨٥٢٤ }

هەروەها لە أبو ئومامەوە دەگێڕنەوە ، کە وتویەتی: پێغەمبەری اللّٰه { ﷺ } فەرموویەتی: هەر کەسێ خۆشەویستی و ڕق و قینی و بەخشین و نەبەخشینی لە پێناوی اللّٰه تعالی ـدا بێت لەبەر ڕەزامەندی ئەو بێت ئەو کەسە ئیمانی تەواوە .

عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ { ﷺ } أَنَّهُ قَالَ : مَنْ أَحَبَّ لِلَّهِ، وَأَبْغَضَ لِلَّهِ، وَأَعْطَى لِلَّهِ، وَمَنَعَ لِلَّهِ ؛ فَقَدِ اسْتَكْمَلَ الْإِيمَانَ .
{ سنن أبي داود ٤٦٨١ }

هەروەها أنس (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) دەفەرمویێت: پێغەمبەری اللّٰه { ﷺ } فەرموویەتی: کەستان باوەڕی دامەزراوی نییە هەتا منی لەباوک و دایکی و منداڵەکانی و لەهەموو خەڵکیش خۆشتر نەویێت .

عَنْ أَنَسٍ قَالَ : قَالَ النَّبِيُّ { ﷺ }: لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ، وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ .
{ صحيح البخاري ١٥ }

هەر کەسێک لەگەڵ ئەوە دەبێت کە خۆشی دەوێت و لەگەڵی حەشر دەکرێت :

لە أنس (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەری اللّٰه { ﷺ } کرد دەربارەی ڕۆژی قیامەت ، ووتی: کەی ڕۆژی قیامەت دێت ؟
فەرمووی: چیت بۆ ڕۆژی قیامەت ئامادە کردووە ؟ ووتی: هیچم ئامادە نەکردووە، تەنها ئەوە نەبێ کە من اللّٰه و پێغەمبەرەکەیم خۆش دەوێت { ﷺ } پێغەمبەر { ﷺ } فەرمووی: تۆ لەگەڵ ئەو کەسەدایت کە خۆشت دەوێت.
أنس فەرمووی: بە هیچ شتێک دڵخۆش نەبووین بە ئەندازەی دڵخۆشیمان بەم وتەیەی پێغەمبەر{ ﷺ } کە فەرمووی: تۆ لەگەڵ ئەو کەسەدایت کە خۆشت دەوێت.
أنس ووتی: جا لەبەر ئەمە من پێغەمبەر{ ﷺ } و ئەبو بەکر و عومەرم خۆشدەوێت، وە ئومێدەوارم کەوا لەگەڵ ئەواندا بم بە خۆشەویستیم بۆیان، ئەگەر چی کردەوەشم نەکردبێت وەک کردەوەکانی ئەوان.

عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ النَّبِيَّ { ﷺ } عَنِ السَّاعَةِ، فَقَالَ : مَتَى السَّاعَةُ ؟ قَالَ : وَمَاذَا أَعْدَدْتَ لَهَا ؟ قَالَ : لَا شَيْءَ، إِلَّا أَنِّي أُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ { ﷺ } . فَقَالَ : أَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ . قَالَ أَنَسٌ : فَمَا فَرِحْنَا بِشَيْءٍ فَرَحَنَا بِقَوْلِ النَّبِيِّ { ﷺ } : أَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ . قَالَ أَنَسٌ : فَأَنَا أُحِبُّ النَّبِيَّ { ﷺ } ، وَأَبَا بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ مَعَهُمْ بِحُبِّي إِيَّاهُمْ، وَإِنْ لَمْ أَعْمَلْ بِمِثْلِ أَعْمَالِهِمْ.
{ صحيح البخاري ٣٦٨٨ }

هەروەها لە عبداللّه (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: پێغەمبەر{ ﷺ } فەرمووی: مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسەدایە کە خۆشی دەوێت .

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ، عَنِ النَّبِيِّ { ﷺ } أَنَّهُ قَالَ : الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ .
{ صحيح البخاري ٦١٦٨ }

جا بۆیە خۆشویستن بابەتێکی گرنگە لە دینی ئیسلامدا (ولاء و براء)ـی تێدایە واتە دۆستایەتی و دژایەتی جا دەبێ بزانی دۆستی کێیت و دوژمنی کێیت و کێت خۆش دەوێت و ڕقت لە کێیە ، وە هەموو خۆشەویستیەکت دەبێ بۆ ئەهلی ئیمان و ئیسلام بێت و هەموو ڕقلێبونەوەیەکیشت بۆ ئەهلی کوفرو کافران بێت ، وە ئەمە بەجێ گەیاندنی( ولاء و براء)ـە کە ڕوکنێکی ئەساسییە لە دینی ئیسلامدا ، هەر بۆیە پێغەمبەر{ ﷺ } دەفەرموێت: پیاو لەسەر دین و ڕێبازی هاوڕێکەیەتی ، با هەر یەکێک لە ئێوە سەیر بکات بزانێ کێ هاوڕێیەتی .
{ سنن أبي داود ٤٨٣٣ }

کەواتە ئاگاداربە بزانە تێکەڵی کێ دەکەیت و لەگەڵ کێ هاوڕێیت و کێت خۆش دەوێت چونکە لەگەڵ ئەو کەسە حەشر دەکرێی کە خۆشت دەوێت .

## مەرجی شەشەم : الإنقیاد ـ گوێڕایەڵی و تەسلیم بوون

الإنقیاد واتە گوێڕایەڵی کردن تەسلیم بوون واتە دەبێ تەسلیمی بیت هەرچیەکی ووت نابێ بڵێی نا ، وە (الإقياد المنافي للترك) الإنقیاد دژەکەی تەرکە واتە وازلێهێنان تۆ نابێ واز لە( لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰه ) بێنی دەبێ بە دڵ و بە گیان لە گەڵی بیت و تەسلیمی بیت ( أن تعبدوا اللّٰه وحده والاتنقاد للشرعة وتؤمن بها وتحتقيد أنها الحق ) تۆ کە وتت موسوڵمانم ئەوە دەبێ بە کردەوە بیسەلمێنی کە موسوڵمانی و لە دڵیشتەوە لەگەڵی بیت و بە تەواوی تەسلیمی بیت ، نەک وەک بەناو موسوڵمانی ئەمڕۆ بە زمان دەڵێ ڕازیم و گوێڕایەڵی فەرمانی اللّٰە ـ م کەچی کە دێتە سەر واقعی حاڵ دژی دەوەستێتەوە ! جا ئەمە لای اللّٰە تعالی قەبوڵ کراو نییە وە داوات لێ کراوە کە بەتەواوی تەسلیمی اللّٰە و فەرمانەکانی و شەریعەتەکەی بیت و لەهیچ شتێک نەڵێی نەخێر .

اللّٰە تعالی دەفەرموێت: [ وَأَنِيبُوٓا إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُۥ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ] { الزمر ٥٤ }
واتە: بگەڕێنەوە بۆلای پەروەردگارتان و ملکەچی فەرمانی ئەوبن پێش ئەوە سزاکەتان بۆ بێ دواییش ئیتر لەلایەن هیچ کەسێکەوە یارمەتی نادرێن .

الطبری (٣١٠هـ) لە تەفسیرەکەی دەڵێ: اللّٰە تعالی دەفەرموێت: ئەی خەڵکینە ڕوو بکەنە پەروەردگارتان و برۆن بەرەو پەروەردگار بە تەوبەکردنەوە وە بگەڕێنەوە بۆلای بە گوێڕایەڵی کردن بۆی وە وەڵامی بدەنەوە لەوەی بانگتان دەکات بۆی لە تەوحیدەکەی، وە بە تاک دانانی لە عیبادەت و وە ئیخلاص و نیەت پاکی لە عیبادەتەکان بۆی .

هەروەک بشر بۆی گێڕاینەوە ، ووتی یزید بۆی گێڕاینەوە ، ووتی سعید بۆی گێڕاینەوە لە قتادة (١١٨هـ) دەربارەی وتەی اللّٰە تعالی: [ وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ ] فەرمووی : ڕوو بکەنە پەروەردگارتان و بەرەو پەروەردگارتان برۆن .

هەروەها محمد بۆی گێڕاینەوە ، ووتی أحمد بۆی گێڕاینەوە ، ووتی أسباط بۆی گێڕاینەوە لە السدي (١٢٧هـ) دەربارەی وتەی اللّٰە تعالی: [ وَأَنِيبُوا ] فەرمووی: وەڵامی بدەنەوە .

هەروەها یونس بۆی گێڕامەوە ، ووتی: ابن وهب(١٩٧هـ) هەواڵی پێداین ووتی: ابن زيد(١٨٢هـ) دەربارەی وتەی اللّٰە تعالی: [ وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ ] فەرمووی: تەوبە و پەشیمانی ، گەڕانەوە بۆ گوێڕایەڵی پەروەردگار وە جیابوونەوە و وازهێنان لەوەی لەسەری بوون ( لە تاوان ) ئایا نابینی اللّٰە دەفەرموویێت: مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَاتَّقُوهُ ( بۆلای پەروەردگار بگەڕێنەوە و تەقوای بکەن ) .

وە وتەی اللّٰە تعالی: [ وَأَسْلِمُوا لَهُ ] دەیفەرموو: ملکەچ بن بۆی بە گوێڕایەڵی وە دان بەدینی پاک و تەوحید بنێن ، [ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ ] پێش ئەوەی سزاتان بۆ بێت لەلایەن پەروەردگارەوە لەسەر کوفرکردنتان پێی .

[ ثُمَّ لَا تُنْصَرُونَ ] پاشان هیچ سەرخەرێک سەرتان ناخات جا نەجاتتان نادات لە سزاکەی کە دێتە سەرتان .
{ تفسير الطبري }

ئەوە اللّٰە تعالی لە قورئانەکەی پێمان دەفەرموێت: تەسلیم بن با تەسلیمی بین بزانین چی دەفەرموێت وەرە قورئان بخوێنەوە وەرە فەرموودەی پێغەمبەرەکەی { ﷺ } بخوێنەوە بزانە چی دەڵێت ، بێگومان سەرفرازی لەناو قورئان و فەرموودەو شەریعەتە پاکەکەی اللّٰە تعالی ـدایە بەتەنها وە هەموو ڕێگەکانی تر لەسەر گومڕاییە و هەموو گومڕاییەکیش لە ئاگر دایە هەروەک پێغەمبەر{ ﷺ } دەفەرموویێت: بەنی ئیسرائیل بەسەر حەفتا و دوو گروپ دابەش بوون ، ئوممەتەکەی منیش بەسەر حەفتا و سێ گروپ دابەش دەبن ، هەموویان لە ئاگردان جگە لە یەک گروپی نەبێ ، وتیان: ئەوە کامەیە یا رسول اللّٰە { ﷺ } ؟ فەرمووی: ئەوەی من و هاوەڵانی منی لەسەرە. { سنن الترمذي ٢٦٤١ }

کەوایە با لەسەر ئەوە بین کە پێغەمبەر { ﷺ } و هاوەڵەکانی لەسەر بووە بۆ ئەوەی لە گرووپە ڕزگاربووەکە بین .

هەروەها اللّٰه تعالی دەفەرموێت: [ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا ] { النساء ١٢٥ }
واتە: ئاخۆ دینداریک هەبێ ئایینی لەوکەسە باشترو چاکتر بێ کەخۆی دابێتە دەستی اللّٰه ـو ئاکارچاکیش بێ و کەوتبێتە شوێنی ئایینی پاکی ئیبراهیمی کە لەهەمووشتێ لایدابێ و، هەر تەنها بەرەو اللّٰه هاتبێ؟ لەکاتێکدا اللّٰه ئەو ئیبراهیمەی کردۆتە دۆست و خۆشەویستی خۆی، دەسا ئێوە پەیرەویی لێبکەن .

الطبري(٣١٠هـ) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێ: ئەوە بڕیارێکی پەروەردگارە بۆ ئیسلام و ئەهلەکەی بە هەبوونی ڕێز و فەزڵ و گەورەیی بەسەر باقی میللەتانی تر و ئەهلەکانیشیان ، اللّٰه دەفەرموێت: [ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا ] ئەی خەڵکینە باشترین و پێکاوترین ڕێگا وە ڕێنموونی ترینی ڕێگاکان ،[ مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ ] دەفەرموێت: ئەو کەسەی ڕووگەی تەسلیم دەکات بە پەروەردگار بە گوێڕایەڵی کردنی ، وە بەڕاست زانین و دانانی پێغەمبەرەکەی محمد { ﷺ } بەوەی کە هێناویەتی لەلایەن پەروەردگاریەوە ، [ وَهُوَ مُحْسِنٌ ] واتە: بکەرە بەوەی فەرمانی پێ کراوە لەلایەن پەروەردگاریەوە ، ئەوەی کە اللّٰه حەرامی کردووە  ئەویش بە حەرامی دەزانێت و حەرامی دەکات وە ئەوەشی کە اللّٰه حەڵاڵی کردووە ئەویش بە حەڵاڵی دەزانێت و حەڵاڵی دەکات ، [ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ] واتە بەمە: شوێن کەوتووی ئەم دینەیە کە إبراهیم ـی دۆستی الرحمٰن لەسەری بووە ، وە فەرمانی کرد بە کوڕەکانی لە دوای خۆی وە ئامۆژگاری کردن پێی ، [ حَنِيفًا ] واتە: لەسەر ڕاستە ڕێی مەنهەجی إبراهیم ـە علیه السلام .

هەروەها الطبري(٣١٠هـ) دەڵێ: يحيىٰ بن أبي طالب(٢٧٥هـ) بۆی گێڕامەوە ، ووتی: يزيد هەواڵی پێداین ، ووتی: جويبر هەواڵی پێداین لە الضحاك(١٠٥هـ) فەرمووی: اللّٰه فەزڵی ئیسلامی داوە بەسەر هەموو دینەکاندا و فەرموویەتی: [ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا

مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا ] { النساء ١٢٥ }

وە هیچ کردەوەیەک قەبوڵ نییە لە غەیری ئیسلام ، وە ئەمە الحنیفیة ( واتە لادان لە شیرک و ڕۆشتن بەرەو تەوحید ).

{ تفسیر الطبري }

وە لە ئایەتێکی تردا اللّٰه تعالی دەفەرموێت: [ وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ وَإِلَى ٱللَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ] { لقمان ٢٢ }

واتە: هەرکەسێک کە بەتەواوی و بەدڵێکی پاکەوە ڕووبکاتە اللّٰه و چاکە کاریش بێت بێگومان دەستی بە قوڵپی هەرە پتەوەوە گرتووە کەدەی گەیەنێ بە اللّٰه ، هەرچۆن کەسێک بەشاخێکدا سەرکەوێ، یان دابەزێ، دەست بە ئەڵقەیەکی زۆر قایمەوە دەگرێ، دیارە ئەمیش بەهێزترین ڕێگاو ڕێبازی بۆ خۆی هەڵبژاردووە وە ئەنجامی هەمووکارێکیش هەر بۆلای اللّٰه ـیە .

الطبري(٣١٠ هـ) دەڵێ: ابن وكيع بۆی گێڕاینەوە ، ووتی: باوکم بۆی گێڕاینەوە ، لە سفيان(١٦١ هـ) ، لە أبي السوداء ، لە جعفر بن أبي المغيرة ، لە سعيد بن جُبَير(٩٥ هـ) ، لە ابن عباس(٦٨ هـ) دەربارەی وتەی اللّٰه تعالی: [ وَمَنْ يُسْلِمْ وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى ] فەرمووی: [ الْعُرْوَةِ الْوُثْقَى ]

واتە: لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ اللّٰه . واتە: هەرکەسێک کە بەتەواوی و بەدڵێکی پاکەوە ڕووبکاتە اللّٰه و چاکە کاریش بێت ئەوە دەستی گرتووە بە [ الْعُرْوَةِ الْوُثْقَى - واتە: لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ اللّٰه ] واللّٰه اعلم .

{ تسير الطبري }

هەروەها لە فەرموودەش هاتووە موعتەمەر دەیگێڕێتەوە ، دەڵێ بیستم بەهزی کوڕی حەکیم ، لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە: لە باپیریەوە(رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما) دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری اللّٰه { ﷺ } من سوێندم خواردووە بە ژمارەی پەنجەکانی دەستم هەرگیز نەیەم نە بۆ لای تۆ ، نە بۆ لای ئاینەکەت ، من کەسێکم هیچ نازانم مەگەر

ئەوەی اللّٰه تعالی و پێغەمبەرەکەی فێری کردووم ، بەڕاستی من داوات لێ دەکەم بە ڕوخساری اللّٰه ، بەچی تۆی ناردووە بۆ ناومان ؟ فەرمووی: بە ئیسلام ووتی: وتم: نیشانەکانی ئیسلام چییە ؟ فەرمووی: ئەوەیە کە بڵێی ڕوخساری خۆمم ڕادەستی اللّٰه کرد ، وە خۆم دارِنی لە هاوبەشدانان ، نوێژیش بکەیت و زەکاتیش بدەیت ، هەموو موسوڵمانێ لەسەر موسوڵمان حەرامە ، دوو بران یەکتر سەردەخەن ، اللّٰه هیچ کردەوەیە وەر ناگرێ لە کەسێکی هاوبەشدانەر دوای ئەوەی موسوڵمان دەبێ ، هەتا هیجرەت نەکات بۆ ناو موسوڵمانان .

حَدَّثَنَا الْمُعْتَمِرُ ، قَالَ : سَمِعْتُ بَهْزَ بْنَ حَكِيمٍ يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ ، عَنْ جَدِّهِ قَالَ : قُلْتُ : يَا نَبِيَّ اللَّهِ، مَا أَتَيْتُكَ حَتَّى حَلَفْتُ أَكْثَرَ مِنْ عَدَدِهِنَّ - لِأَصَابِعِ يَدَيْهِ - أَلَّا آتِيَكَ وَلَا آتِيَ دِينَكَ، وَإِنِّي كُنْتُ امْرَأً لَا أَعْقِلُ شَيْئًا إِلَّا مَا عَلَّمَنِي اللَّهُ وَرَسُولُهُ، وَإِنِّي أَسْأَلُكَ بِوَجْهِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، بِمَا بَعَثَكَ رَبُّكَ إِلَيْنَا ؟ قَالَ : بِالْإِسْلَامِ . قَالَ : قُلْتُ : وَمَا آيَاتُ الْإِسْلَامِ ؟ قَالَ : أَنْ تَقُولَ : أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ وَتَخَلَّيْتُ . وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ، كُلُّ مُسْلِمٍ عَلَى مُسْلِمٍ مُحَرَّمٌ، أَخَوَانِ نَصِيرَانِ، لَا يَقْبَلُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مِنْ مُشْرِكٍ بَعْدَمَا أَسْلَمَ عَمَلًا، أَوْ يُفَارِقَ الْمُشْرِكِينَ إِلَى الْمُسْلِمِينَ .
{ سنن النسائي ٢٥٦٨ }

کەوایە کەسی موسوڵمان دەبێت تەسلیمی اللّٰه بێت و فەرمانبەرداری بێت ، وە ئەو تەسلیم بونەشی تا دەمرێت بەردەوام بێت و هیچ کاتێک تەرکی نەکات چونکە تەرککردن دژی تەسلیم بوونە ، نابێت بە هیچ شێوەیەک تەرکی دین بکەیت چونکە گەر تەرکی بکەیت ئەوە( لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ اللّٰه ) کەت هەڵوەشاندۆتەوەو بویتە یەکێک لە خەسارەتمەندان و دواجار شوێن و جێگات ئاگری دۆزەخە بە هەتا هەتایی ، جا بۆیە تۆی موسوڵمان تا ڕۆح لە جەستەت دایە پارێزگاری لە ( لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ اللّٰه ) کەت بکەو بە تەوحیدەوە بگەڕێوە لای اللّٰه تعالی تا یەکێک بیت لە کەسە براوەو بەختەوەرەکان .

# مەرجی حەوتەم : القبول ـ ڕازیبوون

واتە قەبوڵکردن و ڕازی بوون پێی ، واتا کەسی موسوڵمان دەبێت ڕازیبێت و ملکەچ بێت بۆ هەموو دینی ئیسلام وە قەبوڵی بێت بە دڵ و زمان و کردار ، وە دژی قەبوڵ کردن - ڕەتکردنەوەیە و ڕازی نەبوونە بە دینی اللّٰه تعالی ، بۆیە ئەوکەسەی کە دەڵێت من دەبم بە موسڵمان و لَآ إِلَٰهَ إِلَّا اللّٰه دەڵێت دەبێت تێکڕای دینی ئیسلامی قەبوڵ بێت بەهەموو بەشەکانیەوە ، وەک چۆن اللّٰه تعالی دەفەرموێت: [ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا ٱدْخُلُوا فِي ٱلسِّلْمِ كَآفَّةً وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ] { البقرة ٢٠٨ }

واتە: ئیسلامت دەبێ گشت قبووڵ بێ: ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە ، دەبێ هەمووتان ئامادەی چوونە ناو فەرمانی اللّٰه بن هەرگیزیش شوێنی هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون ، چونکە دیارە کەشەیتان بەئاشکرا دوژمنتانە .

بۆیە دەبێت ئەوکەسەی کە دەیەوێت موسڵمان بێت یان خۆی بە موسڵمان دەزانێت پێویستە هەموو دینی ئیسلامی قبوڵ بێت ، وە بۆیان نیە کە خۆشیان سەر پشک بکەن (واتا بۆیان نیە کە بە ئارەزووی خۆیان بکەن کە ئایە ڕازین بە فەرمانی اللّٰه تعالی و رسول ـەکەی { ﷺ } یاخود نا) هەر وەکو دەبینین لە پەرلەمانەکان ئایەتی اللّٰه تعالی دەخرێتە دەنگدانەوە ئایا ڕازی بن پێی یان نا ! پەنا بە اللّٰه ئەمە کوفرێکی ڕون و ئاشکرایە ، وە زۆر بەی ئەوانەشی کە خۆیان بە موسوڵمان دەزانن دەچن پشتگیری ئەوانە دەکەن و دەنگیان پێ دەدەن ، کە ئەمەش پێچەوانەی ئەوەیە کە دەڵێن موسوڵمانین ، بەڵکو دەبێت گوێڕایەڵ بن بۆ فەرمانی اللّٰه تعالی و پێغەمبەرەکەی { ﷺ } وە پێی ڕازین: وەک چۆن اللّٰه تعالی دەفەرموێت: [ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ] { الأحزاب ٣٦ }

واتە : بۆ هیچ پیاوێکی ئیماندار یان ژنێکی ئیماندار ، نیە کاتێک کە اللّٰه ـو پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێک بدەن ئەوان سەرپشک بن (لە ئەنجامدانی ئەو کارە)

چونکه ئەوەی سەرپێچی بکات لە فەرمانی اللّٰه ـو پێغەمبەرەکەی ئەوە ئیتر بە ئاشکرا گومڕاو سەرلێشێواوە .

هەروەها اللّٰه تعالى دەفەرموێت:
[ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ وَقَالُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ]
{ البقرة ٢٨٥ }
واتە: پێغەمبەرو ئیمانداران باوەڕیان هەیە بەوەی لە لایەن پەروەردگاریانەوە هاتۆتە خوارەوە، هەموویان باوەڕیان هەیە بە اللّٰه و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی (دەڵێن) هیچ جۆرە جیاوازیەک ناکەین لە نێوان هیچ پێغەمبەرێک لە پێغەمبەرەکانی اللّٰه ـدا (لە باوەڕدا)، هەروەها وتیان: گوێڕایەڵ و ملکەچین (بۆ بەدیهێنەرمان) پەروەردگارا لێخۆش بوونی تۆمان دەوێت و سەرئەنجام هەر بۆ لای تۆیە گەڕانەوە .

دەبێت کەسی موسوڵمان ئیمانی بە سەرجەم پێغەمبەران هەبێت و جیاوازی نەکات لەوەی کە هەموویان بۆ گەیاندنی تەوحید هاتوون و لە پێناویدا توشی ئازار و ناڕەحەتی و کوشتن بونەتەوە ، وە نابێت هیچ پێغەمبەرێک بە درۆ بزانی چونکە ئەمە دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی ئەم مەرجەی( لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ اللّٰه )ـو دەبیتە یەکێک لە گومڕاو دەرچوان لە دینی ئیسلام ، وە اللّٰه تعالى لە قورئان باسی قەومەکانی تری بۆکردووین کاتێک پێغەمبەرەکانیان بە درۆ زانی سەر ئەنجام توشی لەناو چوون بونەوە .

هەروەها اللّٰه تعالى باسی موشریکە خۆ بەزلزانەکانمان بۆ دەکات کاتێک خۆیان بە گەورە زانی و ڕازی نەبوون بڵێن( لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ اللّٰه ) اللّٰه تعالى دەربارەیان دەفەرموێت:
[ إِنَّهُمْ كَانُوٓا۟ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ] { الصافات ٣٥ }
واتە: چونکە ئەوان کاتێ پێیان گوترابا هیچ پەرستراوێکی هەق نیە جگە لە(اللّٰه)، پشتیان هەڵدەکرد و خۆیان زۆر بەزل دەزانی .

الطبري(٣١٠ هـ) دەڵێ: محمد بن الحسين بۆی گێڕاینەوە ، ووتی: أحمد بن الفضل بۆی گێڕاینەوە ، ووتی: أسباط بۆی گێڕاینەوە له السدي(١٢٧ هـ) دەربارەی وتەی اللّه تعالی [ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ] فەرمووی: واتە بەتایبەت موشریکەکان . [ واتە موشریکەکان ڕەتی دەکەنەوە کە بە حەق بڵێن لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ اللّه ، وە ئەمڕۆش ئەمە بە چاوی خۆمان دەبینین کە تەنها بە زمان دەڵێن لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ اللّه بەحەق لەگەڵی نین و دژی دەوەستنەوە ، واللّه اعلم ].
{ تفسير الطبري }

هەروەها اللّه تعالی دەفەرموێت: [ أَجَعَلَ ٱلْءَالِهَةَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عُجَابٌ ]
{ ص ٥ }
واتە: موشریکەکان دەیان ووت ئەرێ هەموو خواکانی کردۆتە یەک خوا؟! بەڕاستی ئەمە کە محمد { ﷺ } دەیڵێ، واتە (یەک خواپەرستن) شتێکی سەیرو سەمەرەیە !

بینیت موشریکەکان پێیان قەبوڵ نەکرا کە یەک خوا بپەرستن پێیان سەیر بوو بە شتێکی سەیریان دەزانی ! جا ئەوانەی ئەمڕۆش بەو شێوەیەن بانگەشەی ئەوە دەکەن کە موسوڵمانن کەچی پێیان قەبوڵ ناکرێ کە زۆرینەی خەڵکی دۆزەخ ئافرەتە ! پێیان قەبوڵ ناکرێ کە اللّه بەتەنها بپەرستن و بەشداری ئەم هەموو کوفرو شیرکەی کە هەیە لە ناو دیموکراسی و پەرلەمان نەکەن ! پێیان قەبوڵ ناکرێ کە کەسێک دزی بکات دەستی ببڕدرێ ! یان ڕەجمی زیناکار بکرێ ! خۆیان پێ موسوڵمانە کەچی پێیان قەبوڵ ناکرێ حوکم کردن تەنها بۆ اللّه بێت ! ئەی ئەو کەسەی خۆت پێ موسوڵمانە پێویستە خۆت تەسلیمی اللّه تعالی و پێغەمبەرەکەی بکەیت و لەهەموو شتێک بە قسەیان بکەیت و هەموو شتێکت قەبوڵ بێت و بە هەمووی ڕازی بیت و هەر شتێک کە لەلایەن ئەوانەوە هاتووە وەری بگریت و ڕەتی نەکەیتەوەو پێشت ناخۆش نەبێت .

هەروەها لە فەرموودەش هاتووە لە أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: پێغەمبەری اللّه { ﷺ } فەرمووی: هەر کەسێ بڵێ ڕازیم بە اللّه

پەروەردگارم بێ و ئیسلام دین و بەرنامەم بێ و محمد { ﷺ } پێغەمبەرم بێت ، ئەو کەسە بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت .

أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ { ﷺ } قَالَ : مَنْ قَالَ : رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولًا ؛ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ .
{ سنن أبي داود ١٥٢٩ }

کەوایە بزانە ڕەحمەتی اللّٰه تعالی ـت لێبێت بە مەرج لەسەرت گیراوە لە قورئان و فەرمووده کە دەبێ هەموو شتێکی دینت قەبوڵ بێت و پێی ڕازی بیت و ڕەتی نەکەیتەوە ئەو کاتە اللّٰه تعالی شەهادەتی( لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ اللّٰه )ـت لێ قەبوڵ دەکات .

دەبێ ئەو وشەیەت بەحەق قەبوڵ بێت کە( لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ اللّٰه )ـیە بە دڵ و بە زمان و کردارت وە نابێ هیچ شتێک ڕەتبکەیتەوە کە لە قورئان یان
فەرموودەی صحیح هاتووە دەبێ بەتەواوی بەبێ دڵگرانی هەموویت قەبوڵ بێت و ڕەتی نەکەیتەوە دەنا بە ڕەتکردن و ڕازی نەبوون بەیەک شت کە لە دینی ئیسلام بە بەڵگەو دەلیل جێگیر بووە ئەگەر چی شەش مەرجەکەی پێشووشت تێدا بێت کە ئەمەت هەڵوەشاندەوە ئەوە هەمووی هەڵدەوەشێتەوە و دەچیتە ڕیزی تیاچوانەوە ، بۆیە پێویستە بە دڵ و بە گیان ڕازی بیت و قەبوڵت بێت هەر شتێک کە لەم دینەدا هاتووە وە ڕەتی نەکەیتەوەو دژی نەبی بەهیچ جۆرێک .

## مەرجی هەشتەم : الكفر بما يعبد من دون الله ـ بێ باوەڕ بوون بەوەی لە غەیری الله دەپەرستڕێت

بێباوەڕ بوون بەوەی لە غەیری اللّٰه دەپەرستڕێت مەرجە بۆ دامەزراندنی(لَآ إِلَهَ إِلَّآ اللّٰه) ، ئەوەی لە غەیری اللّٰه دەپەرستڕێت و پێی ڕازییە ئەوە طاغوتەو پێویستە کوفری پێ بکرێ ، کوفر بە طاغوت ئەسڵی دینەکەتەو وە بەبێ کوفر بە طاغوت شەهادەتی (لَآ إِلَهَ إِلَّآ اللّٰه) دانامەزرێ ، ئەوەی کە هەموو پێغەمبەران بۆی هاتبوون و فەرمانیان پێ کرابوو کە کوفری پێ بکەن و بە خەڵکیشی ڕابگەیەنن ، هەر وەک چۆن اللّٰه تعالی دەفەرموێت: [ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا ٱلطَّٰغُوتَ ] { النحل ٣٦ }

واتە: بەراستی بۆناو هەموو ئوممەت و نەتەوەیەك لەهەموو سەردەمێكدا پەیامبەرێكمان ناردووە بۆ ئەوە پێیان بڵێ: تەنها اللّٰه بپەرستن و، لە (طاغوت) و یاسا پوچەڵەکان دووربن ، بەڵێ ئەو دووخاڵە: ( اللّٰه پەرستن و، وەلانانی طاغوت) کەهەر پێغەمبەرەی داویەتی بەگوێی ئوممەتەکەی خۆیدا ئەساس و بناغەی گشت ئایینەکان و دینی ئیسلامیشە .

هەروەها اللّٰه تعالی دەفەرموێت: [ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيَ إِلَيْهِ أَنَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا فَٱعْبُدُونِ ] { الأنبياء ٢٥ }

واتە: لەپێش تۆشەوە ئەی پێغەمبەر{ ﷺ } هەر پەیامبەرێكمان ناردووە ئیللا وەحیی و سروشمان بۆكردووە كە: هیچ پەرستراوێک بێ لە من نییە جاکەوایە هەر بەتەنها من بپەرستن .

الطبري(٣١٠ هـ) دەڵێ: بشر بۆی گێڕاینەوە ،ووتی: يزيد بۆی گێڕاینەوە ، ووتی: سعيد بۆی گێڕاینەوە ، لە قتادة(١١٨ هـ) دەربارەی وتەی اللّٰه تعالی: [ وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلا أَنَا فَاعْبُدُونِ ] ، فەرمووی:
پێغەمبەران عليهم السلام نێردراون بە ئیخلاص(واتە نیەتیان پاک بێت و موەحید بن) وە بە تەوحید ، هیچیان لێ وەرناگرێ [ واتە موەحید نەبن هچیان لێ وەرناگیرێ ،

واللە اعلم ] ، أبو جعفر ووتی: من وا تێدەگەم ووتی: کردەوە هەتا دەری ببڕی وە بیخوێنیتەوە ، وە شەرعەکان جیاوازن ، لە تەورات شەریعەتێکە ، وە لە ئینجیل شەریعەتێکە ، وە لە قورئان شەریعەتێکە حەڵاڵ و حەرامی تێدایە ، وە ئەمە هەمووی لە ئیخلاص بۆ اللە وە تەوحید پێکهاتووە .
{ تفسير الطبري }

اللّٰە تعالی دەربارەی کوفر بەطاغوت دەفەرموێت: [ فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤْمِن بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ] { البقرة ٢٥٦ }
واتە: ئینجا هەرکەسێک باوەڕی بە 'طاغوت' نەبێت، دیارە طاغوت ئەو کەسەیە کە لە سنووری اللّٰە دەرچێ و، بەرنامە چەوتەکان قبووڵ کا، جا هەرکەس خۆی لەو جۆرە شتانە دوورگرت و باوەڕی بە اللّٰە هێنا ، ئەوە بێگومانە دەستی بە هەنگڵ و بەهۆکارێکی پتەوو قایمەوە گرتووە پێکدێت لە [ ٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ ] کە هەرگیز هەڵناوەشێت و پسان و پچڕانیشی بۆنییە وە اللّٰە تعالی ـیش بیسەرو زانایە .

واتای [ ٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ ] لە فەرموودەی پێغەمبەری اللّٰە { ﷺ } :
قەیسی کوڕی عوبادە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) فەرمووی: من لە مزگەوتی مەدینە دانیشتبووم پیاوێک هاتە ژوورەوە لەسەر ڕوخساری شوێنەواری خشوع و لە اللّٰە ترسان دەبینرا ، وتیان: ئەم پیاوە لە ئەهلی بەهەشتە ، جا دوو ڕکات نوێژی کرد پاشان چووە دەرەوە ئەوجا منیش شوێنی کەوتم و پێم ووت: کاتێک تۆ هاتیتە ناو مزگەوتەوە وتیان: ئەم پیاوە ئەهلی بەهەشتە .
ووتی: سوێند بە اللّٰە نەدەبوو شتێک کە بە باشی ئاگایان لێی نییە بیڵێن و بڵاوی بکەنەوە شتەکە خۆی ئاوابوو: لەسەردەمی پێغەمبەرخۆیدا { ﷺ } خەونێکم بینی گێڕامەوە بۆی لەخەوما وەک لەناو باخێکدابم زۆر گەورەو پان و پۆڕبوو کۆڵەکەیەکی ئاسن لەناویابوو بنەکەی لەناو زەویەکە دابوو نووکەکەی چووبوو بەحەوادا قوڵفێ بە نوکەکەیەوە بوو نۆکەرێ لەبنیا بوو پێیان ووتم ئادەی پیایدا سەرکەوە ووتم ناتوانم جا نۆکەرەکە هات جلەکانمی لە پشتەوە بەرز کردەوە ئیتر پیایدا سەرکەوتم هەتا سەری سەرەوە چووم قوڵفەکەیم گرت وتیان دەستت

مەحکەم بگرە کەخەبەرم بوویەوە ئەڵقەکە لەناو دەستمدا بوو ! جا کە ئەمەم گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر{ ﷺ } فەرمووی: ئەو باخە ئیسلامەو ئەو کۆڵەکەیەش کۆڵەکەی ئیسلامە ئەو قوڵفەیەیش قوڵفەی قایمە واتە: [ ٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ ]ـیە کە بریتیە لە ئیمان و باوەڕی تەواوی دامەزراو بە اللّٰه و بە ئاینی پیرۆزی ئیسلام ، وە تۆ لەسەر ئیسلامیت هەتا دەمریت . وە ئەم پیاوەش عَبْدُاللَّهِ بْنُ سَلَامٍ بوو (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ).

عَنْ قَيْسِ بْنِ عُبَادٍ قَالَ : كُنْتُ جَالِسًا فِي مَسْجِدِ الْمَدِينَةِ، فَدَخَلَ رَجُلٌ عَلَى وَجْهِهِ أَثَرُ الْخُشُوعِ، فَقَالُوا : هَذَا رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ تَجَوَّزَ فِيهِمَا، ثُمَّ خَرَجَ وَتَبِعْتُهُ، فَقُلْتُ : إِنَّكَ حِينَ دَخَلْتَ الْمَسْجِدَ، قَالُوا : هَذَا رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ. قَالَ : وَاللَّهِ مَا يَنْبَغِي لِأَحَدٍ أَنْ يَقُولَ مَا لَا يَعْلَمُ، وَسَأُحَدِّثُكَ لِمَ ذَاكَ ؛ رَأَيْتُ رُؤْيَا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ { ﷺ } ، فَقَصَصْتُهَا عَلَيْهِ، وَرَأَيْتُ كَأَنِّي فِي رَوْضَةٍ ذَكَرَ مِنْ سَعَتِهَا وَخُضْرَتِهَا وَسْطَهَا عَمُودٌ مِنْ حَدِيدٍ أَسْفَلُهُ فِي الْأَرْضِ، وَأَعْلَاهُ فِي السَّمَاءِ فِي أَعْلَاهُ عُرْوَةٌ، فَقِيلَ لَهُ : ارْقَهْ. قُلْتُ : لَا أَسْتَطِيعُ. فَأَتَانِي مِنْصَفٌ ، فَرَفَعَ ثِيَابِي مِنْ خَلْفِي، فَرَقِيتُ حَتَّى كُنْتُ فِي أَعْلَاهَا، فَأَخَذْتُ بِالْعُرْوَةِ، فَقِيلَ لَهُ : اسْتَمْسِكْ. فَاسْتَيْقَظْتُ، وَإِنَّهَا لَفِي يَدِي، فَقَصَصْتُهَا عَلَى النَّبِيِّ { ﷺ } ، قَالَ : تِلْكَ الرَّوْضَةُ الْإِسْلَامُ، وَذَلِكَ الْعَمُودُ عَمُودُ الْإِسْلَامِ، وَتِلْكَ الْعُرْوَةُ عُرْوَةُ الْوُثْقَى، فَأَنْتَ عَلَى الْإِسْلَامِ حَتَّى تَمُوتَ . وَذَاكَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلَامٍ .
{ صحيح البخاري ٣٨١٣ }

زانایانیش ئەوها تەفسیری [ ٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ ] یان کردووە :

ابن عباس(٦٨ هـ) دەڵێ: واتە لَآ إِلٰهَ إِلَّآ اللّٰه .
أنس بن مالك(٩٣ هـ) دەڵێ: واتە قورئان .
سعيد بن جُبَير(٩٥ هـ) دەڵێ: واتە لَآ إِلٰهَ إِلَّآ اللّٰه .
مجاهد(١٠٤ هـ) دەڵێ: واتە ئیمان .
الضحاك(١٠٥هـ) دەڵێ: واتە لَآ إِلٰهَ إِلَّآ اللّٰه .
السدي(١٢٧ هـ) دەڵێ: واتە ئیسلام .

سالم بن أبي الجعد(١٠٠ هـ) دەڵێ: واتە خۆشەویستی لە پێناو اللّٰه و ڕقلێبونەوە لە پێناو اللّٰه .
{ تفسير بن أبي حاتم ٤٩٦/٢ }

کەوایە بە پێی تەفسیرەکان [ ٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ ] واتە ئیسلام و (لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ اللّٰه) جا بۆیە ئاگاداربە ئەمە بەدەست نایەت هەتا کوفر بە طاغوت نەکەیت بە مەرج گیراوە لەسەرت کە کوفرت بە طاغوت کرد ئەو کاتە شەهادەتی ( لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ اللّٰه )ـت لێ وەردەگیرێ بەبێ هەبونی هیچ هەڵوەشێنەرەوەیەک .

فەرمان کردن بە کوفر بە طاغوت ، اللّٰه تعالی کاتێک باسی ئەوانە دەکات کە ویستیان هەیەو ئارەزوو دەکەن حوکم ببەنەوە بۆ لای طاغوت و بە حوکمی اللّٰه ڕازی نین ، دەفەرموێت: [ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓا أَن يَكْفُرُوا بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلًا بَعِيدًا ] { النساء ٦٠ }

واتە: ئایا نەتڕوانیووەتە ئەو (دووڕووانەی) لافی ئەوە لێ دەدەن گوایە بەڕاستی باوەڕیان هێناوە بەوەی کە بۆ تۆ ڕەوانەکراوە و بەوەش کە پێش تۆ ڕەوانەکراوە (بۆ پێغەمبەران)! کەچی دەیانەوێت ڕووبکەنە طاغوت تا دادوەریان لە نێواندا بکەن و چارەسەری کێشەکانیان بکەن، لەکاتێکدا بە ڕاستی فەرمانیان پێدراوە کە باوەڕیان بە (طاغوت) نەبێت، شەیتانیش دەیەوێت گومڕایان بکات بەگومڕاییەکی دوورو بێ سنوور.

سەیری ئەو بەشەی بکە کە دەفەرموێت [ وَقَدْ أُمِرُوٓا أَن يَكْفُرُوا بِهِۦ ]
واتە: فەرمانیان پێ کرابوو کە بێباوەڕ بن بە طاغوت و کوفری پێ بکەن ، کەوایە ئەمرت پێ کراوە کە کوفر بە طاغوت بکەیت و بێ باوەڕ بیت بە هەموو جۆرێکی طاغوت و لێی دوور بیت .

هەروەها لە فەرموودەش هاتووە لە أَبِي مَالِكٍ ، ئەویش لە باوکیەوە دەفەرموێت: بیستم رسول اللّٰه { ﷺ } دەیفەرموو: هەر کەسێک بڵێ: هیچ خوایەک نییە شایەنی پەرستن بێت بە حەق جگە لە اللّٰه ، وە بێباوەڕ بێت بە ئەوەی لە غەیری اللّٰه دەپەرسترێت[واتە طاغوت] ، ئەوە خوێن و ماڵی حەرامە لەسەر موسوڵمانان ، وە حسابیشی لای اللّٰه ـیە .

عَنْ أَبِي مَالِكٍ ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ : سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ { ﷺ } يَقُولُ : مَنْ قَالَ : لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَكَفَرَ بِمَا يُعْبَدُ مِنْ دُونِ اللَّهِ حَرُمَ مَالُهُ وَدَمُهُ، وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ .
{ صحيح مسلم ٢٣ }

کەوایە بزانە ڕەحمەتی اللّٰه تعالی ـت لێبێت کە کوفر بە طاغوت بە مەرج گیراوە لەسەرت لە قورئان و فەرموودە بۆ وەرگرتنی شەهادەتی (لَآ إِلَهَ إِلَّآ اللّٰه) بەبێ ئەمە شەهادەتی(لَآ إِلَهَ إِلَّآ اللّٰه)ـت لێ وەر ناگیرێت و لە قیامەت یەکێک دەبی لە ئەوانەی کە دەڵێن: [ وَقَالُوا رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا ]
{ الأحزاب ٦٧ }
واتە: دەڵێن: ئێمە ملکەچ و فەرمانبەرداری ئاغاو گەورەکانمان بووین، هەر ئەوان ڕێگەو ڕێبازی (ڕاستیان) لە ئێمە شێواند و ون کرد (اللّٰه ڕسوایان دەکات).
هەروەها اللّٰه تعالی دەفەرموێت: [ أَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ]
{ المؤمنون ١٠٥ }
واتە: (ئەوسا اللّٰه پرسیاریان لێ دەکات) ئایا کاتی خۆی ئایەتەکانی من بەسەرتاندا نە دەخوێنرایەوە؟ کەچی ئێوە بڕواتان پێی نەبوو، بە درۆتان دەزانی؟

ئەوانیش دەڵێن: [ قَالُوا رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ {١٠٦} رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ {١٠٧} ] { المؤمنون ١٠٦-١٠٧ }
واتە: دەڵێن: پەروەردگارا نەگبەتی و نەهامەتی سەرشانی گرتین و زاڵ بوو بەسەرماندا ئێمە کەسانێکی گومڕا بووین ، پەروەردگارا لە ناو ئاگری دۆزەخ و سزاکەیدا دەرمان بهێنە ئەگەر جارێکی تر گەڕاینەوە (بۆ گومڕایی) ئەوە ئیتر دیارە کە ئێمە کەسانێکی ستەمکارین .

اللّٰه تعالى ـيش پێيان دەفەرموێت: [ قَالَ ٱخْسَـُٔوا فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ] { المؤمنون ١٠٨ }
واته: (اللّٰه تعالى له وەڵامياندا به تووڕەييەوە) دەفەرموێت: بێ دەنگ بن و دەمتان داخەن ، قسەشم له گەڵدا مەکەن .

کەوايه پێش ئەوەی کات به سەرماندا تێپەڕێت و بگەينه کاتێک که گەڕانەوەی نييه و کەسيش نابێته فرياد ڕەسمان با ئەم هەشت مەرجەی(لَآ إِلٰهَ إِلَّآ اللّٰه) له خۆماندا بهێنينه دی و بەتەواوی کاری پێ بکەين و ببينه يەکێک له ئەهلی ئەم(لَآ إِلٰهَ إِلَّآ اللّٰه) ـيه .

تێڕامێنه لەم فەرموودەيەی رسول اللّٰه { ﷺ }

ابن عُمَر (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) دەيگێڕێتەوە له پێغەمبەرەوە { ﷺ } که فەرموويەتی: نوێژ بەبێ لەشی پاک و دەست نوێژ وەرناگيرێ ، هەروەها خێرو سەدەقەی دزی و ناپاکی له دەستکەوتی جەنگی (غەنيمەت)ـيش وەرناگرێت .

عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، عَنِ النَّبِيِّ { ﷺ } قَالَ : لَا تُقْبَلُ صَلَاةٌ بِغَيْرِ طُهُورٍ، وَلَا صَدَقَةٌ مِنْ غُلُولٍ . { سنن الترمذي ١ }

کەوايه دڵنيابه چۆن نوێژ بەبێ دەست نوێژ وەرناگيرێ لای اللّٰه ئەوهاش ووتنی (لَآ إِلٰهَ إِلَّآ اللّٰه) بەبێ هەبوونی مەرجەکانی وەرناگيرێ و هيچ سودێک به خاوەنەکەی ناگەيەنێت جا بۆيه مەرجەکانی له خۆتدا بێنه جێ تا به حەقيقی ببيته يەکێک له ئەهلی ئەم (لَآ إِلٰهَ إِلَّآ اللّٰه)ـيه .

# وەڵامی گومانێکی گومڕاکان و قەبر پەرستان

**گومڕاکانی وەک سۆفییە قەبر پەرستەکان و ئەشعەرییەکانی سەردەم دەڵێن ئەم مەرجانەی ( لَآ إِلٰهَ إِلَّآ اللّٰه ) داهێنراوی دوای سەلەفە وەک( ابن تيميەو محمد بن عبدالوهاب ) زانایانی نەجدی کە گوایە ئەمان ئەم مەرجانەیان داناوەو خەڵکیان لەسەر نەبونی ئەم مەرجانە تەکفیر کردووەو پێشتر شتی وا لە سەردەمی سەحابەو دوای ئەوانیش نەبووە ! ئایا ئەمە ڕاستە ؟ بەڕاست ( لَآ إِلٰهَ إِلَّآ اللّٰه ) هیچ مەرجێکی نییە ؟ یان ئەم مەرجانەی کە باسمان کرد لە پێشتر لە سەردەمی سەلەف باسنەکراوە و نەبووە ؟**

**بێگومان ئەمە درۆیەکی گەورەیە کە دەکرێ و چەواشە کردنی خەڵکییە و بانگەوازی خەڵکییە بۆ ڕێگەی دۆزەخ جا بۆیە لێرەدا ئاماژە بە چەند ئەثەرێک دەکەین لە سەلەف کە باسی مەرجەکانی ( لَآ إِلٰهَ إِلَّآ اللّٰه ) ـیان کردووە و دانیان پێدا ناوە ، وە گومانی موشریکان و قەبر پەرستان هەڵدەوەشێنینەوە بە ئیزنی اللّٰه تعالی .**

**ئاماژەکردن بە مەرجەکانی ( لَآ إِلٰهَ إِلَّآ اللّٰه ) لای سەلەف :**

**لە ئیمامی الحسن البصري( ١١٠ هـ ) هاتووە رحمە اللّٰه کە پێی وترا : خەڵکی دەڵێن هەر کەسێ بڵێ ( لَآ إِلٰهَ إِلَّآ اللّٰه )دەچێتە بەهەشتەوە ، ئیمام فەرمووی: هەر کەسێ بڵێ ( لَآ إِلٰهَ إِلَّآ اللّٰه ) و حەق و مافەکانی بدات دەچێتە بەهەشتەوە .**

**ما جاء عن الحسن البصري رحمه الله أنه قيل له : إن ناساً يقولون : من قال « لا إله إلا الله » دخل الجنة ؛ فقال: من قال « لا إله إلا الله » فأدَّى حقها وفرضها دخل الجنة .**

وە هەروەها ئیمامی الحسن البصري( ١١٠ هـ ) بە فەرەزدەقی شاعیری فەرموو : کاتێک خێزانەکەی مردبوو دەیخستە گۆڕ فەرمووی ئەی فەرەزدەق چیت ئامادەکردووە بۆ ئەم ڕۆژە ؟ فەرەزدەق ووتی : شەهادەی( لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ اللّٰه )ـم ئامادەکردووە ماوەی حەفتا ساڵە ، ئیمام فەرمووی : بەڵێ باشترین شتێکە ئامادەت کردووە بەڵام ( لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ اللّٰه ) مەرجی هەیە ، جا ئاگاداربە ئامان نەکەی بوهتان بۆ ئافرەتێکی داوێن پاک بکەیت .

[ فەرەزدەق شاعیر بووە بۆیە ئیمامی الحسن البصري ترساندوویەتی نەکا لەشیعرەکانیدا بوهتان بۆ ئافرەتێکی داوێن پاک بکات ].

وقال الحسن للفرزدق وهو يدفن امرأته : ما أعددتَ لهذا اليوم ؟ قال : شهادة أن لا إله إلا الله منذ سبعين سنة، فقال الحسن : نعم العدة لكن لـِ « لا إله إلا الله » شروطاً ؛ فإياك وقذف المحصنات .

{ معارج القبول بشرح سلم الوصول الى علم الأصول في التوحيد صـ ٢٣١ }

هەروەها وهب بن منبه( ١١٤ هـ ) بەکەسێکی فەرموو : کە پرسیاری لێی کردبوو ، ئایا ( لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ اللّٰه ) کلیلی بەهەشت نیە؟

وهب فەرمووی بەڵێ ، بەڵام هیچ کلیلێک نیە ئیلا ددانی هەیە ، ئەگەر تۆیش هاتی بە کلیلەکەوە کە ددانی هەبوو ئەوە بۆت دەکاتەوە وە ئەگینا بۆت ناکاتەوە .

وقال وهب بن منبه لمن سأله : أليس مفتاح الجنة « لا إله إلا الله » ؟ قال : بلى ؛ ولكن ما من مفتاح إلا له أسنان ، فإن أتيت بمفتاح له أسنان فُتح لك ، وإلا لم يُفتح لك . { الأسماء والصفات للبيهقي ١/٢٧٤ }

[ چەند جوان وەسفی کردووە کلیلێک ئەگەر دانەکانی نەبێ دەرگات بۆ ناکاتەوە ، ( لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ اللّٰه ) ئەگەر مەرجەکانی تێدانەبوو ناتوانی پێی بچیتە ناو بەهەشتەوە ، ددانەکانی ئەو کلیلە کە وشەی ( لا اله الا اللّٰه )ـیە ئەوە ڕوکن و مەرجەکانیەتی ، وەک لە زۆر فەرموودە هاتووە کە باس لەوە دەکات ( لَاْ إِلَهَ إِلَّاْ اللّٰه ) هۆکارە بۆ

ئەوەی خاوەنەکەی بخاتە بەهەشتەوە ، وە لەگەڵ ئەو چوونە بەهەشتەوە چەندین مەرج دانراوە بۆ خاوەنەکەی چونکە بەبێ ئەو مەرجانە ئەو وشەیە کە ( لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ اللّٰه )ـیە قەبوڵکراو نییە و وەر ناگیرێت وەک لە پێشتر باسی ڕوکن و مەرجەکانمان کرد بە بەڵگەی قورئان و فەرموودە ].

بە پێی ئەم دەلیل و بەڵگانە گومانی قەبر پەرستانمان پوچەڵ کردەوە کە دەڵێن مەرجەکانی( لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ اللّٰه ) لای سەلەف نەبووە و دوای ئەوان دروستکراوە بێگومان درۆیان کردوو وە درۆکانیشیانمان هەڵوەشاندەوە ، ولله الحمد .

کەوایە بزانە ڕەحمەتی اللّٰه تعالى ـت لێبێت کە ووتنی ( لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ اللّٰه ) تەنها بە زمان بەبێ ئەوەی حەق و مافەکانی بدەیت و مەرجەکانی لە خۆتدا جێبەجێ بکەیت ئەوە هیچ سودێکت پێ ناگەیەنێت و ناتباتە بەهەشتەوە ، جا بۆیە تا ڕۆح لە جەستەت ماوە لە واتای ( لَاْ إِلٰهَ إِلَّاْ اللّٰه ) تێ بگەو مەرجەکانی بە تەواوی لە خۆتدا بێنە جێ تا لە قیامەت ببێتە هۆی ئەوەی کە لە ئاگر ڕزگارت بکات و بتباتە بەهەشتی هەتا هەتاییەوەو بە نەمری تێیدا بە ئاسودەیی و بێ هیچ ناڕەحەتییەک تێیدا بژیت ، اللّٰه تعالى بیکاتە نسیبی هەموو موسوڵمانێک ، آمــین .

کۆتاییمان بەوە دەهێنین کە تۆ هەتاوەکو شەو و ڕۆژ ئەم مەرجانەی کە باسمان کرد بخوێنیتەوە بەڕاستی نرخی لەکەم بوون نییە هەر لە زیاد بوونە ئەبێ باش ئاگادار بیت لێشی بێ تاقەت نەبی چونکە هەموو قورئانەکەی تۆ لەسەر ئەمەیە وە هەموو قورئانەکەت بۆ ئەمە هاتووە وە هەموو پێغەمبەران علیهم السلام بۆ ئەمە هاتوون وە هەموو جن و ئینس بۆ ئەمە دروستکراوە خۆشەویستانم .

